

# بگە بە مەرام لە حوکم و ناسینی جۆرەکانی حوکام


نوسینی

نوسەر و بانگخواز

**مامۆستا سەرباز محمد حسن**





پێگەی مینبەر

١٤٣٢ک

بسم الله الرحمن الرحيم

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره، ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له، ومن يضلل فلا هادي له، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأشهد أن محمدًا عبده ورسوله ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلاَ تَمُوتُنَّ إِلاَّ وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾ (سورة آل عمران :١٠٢).

﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاء وَاتَّقُواْ اللّهَ الَّذِي تَسَاءلُونَ بِهِ وَالأَرْحَامَ إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً﴾ (سورة النساء: ١).

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ (سورة الأحزاب:٧٠ ، ٧١).

أمّا بعد: [فإنَّ أَصْدَقَ الحَدِيث كَلامُ الله، وخَيْرَ الهَدي هَديُ مُحمّدٍ -صلى الله عليه وعلى آله وسلم- وَشَرَّ الأمورِ مُحْدَثاتُها وَكل مُحْدَثةٍ بدعة، وَكلَّ بدعةٍ ضلالة، وَكل ضلالةٍ في النّار] (صحيح مسلم).

## پێشەکییەک:-

لە گەورەترین نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار بەسەر مرۆڤایەتی دابەزاندنی ئەو قورئانە پیرۆزەیە بۆ سەر بەرزترین و پاکترین و چاکترین کەس کە ئەو گەردونە بەخۆیەوە بینیێ ، (محمدی کوڕی عەبدولا) سەڵات و سەلامی خوای گەورەی لەسەربێ، ئەو قورئانەی ئەوەی شوێنی کەوێ سەر بەرزی دونیا و دوا ڕۆژ دەبێ ، ئەوەی لە ڕوشی بوەستێ سەرشۆ ڕی دونیا و دوا ڕۆژ دەبێ، قورئانێك دوا پەیامی خوای پەروەردگارە بۆ ئینس و جن، قورئانێکە هەرچی چاکەیە فەرمانی پێکردووە و هەرچی خراپەشە لێی قەدەغە کردوین، قورئانێکە زیاد لە هەموو موعجیزەی پێغەمبەرانی تر بەوەفاتی پێغەمبەری خۆشەویستمان-صلى الله عليه وسلم- نەکۆن دەبێ و نەزەمەنیش کاری تێدەکا، وە بەدیلی هەموو بەرنامەیەکە گەر مرۆڤایەتی مەخسەدی بێ پەیڕەوی بکا، وە هیچ پەیڕەو و بەرنامەیەکیش نابێتە بەدیلی گەل کۆڕای جین و ئینسیش بێت، بەسە ئەوەندە بۆ ئێمەی مرۆڤ کەلامی خوای پەروەردگارمان لەبەر دەستە، چۆن دابەزیوە ئاواش بە ئێمە گەیشتووە ئاواش دەمێنێ تا ئەو کاتەی خوای گەورە(سبحانه وتعالى) مەشیئەتی لەسەر دەبێ و لەسەر ئەو زەمینە هەڵیدەگرێ، ئەو قورئانەی دابەزیوەتە سەر دڵی چاکترین و پاکترین مرۆڤ هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم، زەوی هیچ مرۆڤێکی لە پلەی ئەو بەخۆوە نەبینوە و ناشیبینێ - سەڵات و سەلامی خوای پەروەردگاری لەسەربێ.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: [لتنقضن عرى الإسلام عروة عروة فكلما انتقضت عروة تشبث الناس بالتي تليها فأولهن نقضا الحكم وآخرهن الصلاة] (صحيح الترغيب والترهيب ١/ ١٣٨).

"گرێکانی ئەو ئیسلامە یەك لە دوای یەك هەڵدەوەشێتەوە، هەر کە گرێکان هەڵوەشایەوە خەڵکی دەستی بەوەی تر دەگرن، یەکەمیان کە هەڵدەوەشێتەوە حوکە و دوایشیان نوێژە".

## هەڵوەشاندنەوەی حوکمەکانی ئیسلامیش دوو هۆکاری سەرەکی هەیە:

هۆکاری یەکەم: چڕی پیلانی دوژمنان.

هۆکاری دووەم: جەهلی موسڵمانان بەو دینە.

وای لەو غوربەتەی موسڵمانان لێی دەژین ئەوەی تۆزقاڵێ باوەڕی لە دڵ دابێ جەرگی بەحاڵی موسڵمانان دەهێشێ، لە قیادەی مرۆڤایەتیەوە بۆ قیادەکردنیان لەلایەن خەڵکانێك هیچ نەسیبیان لە خەیر و چاکە نییە، ئەوەی کە ئاماژەی پێدەکەین موعاناتە نەوەك چۆکدان و بێئومێد بوون بێ لە هاتنەوەی ئەو دینە.

موسڵمان دەبێ دڵنیا بێ لەوەی کە پیلانی دوژمنان هەرچەندە چڕبێ ناتوانن خۆیان لەو پیلانە ڕزگار کەن کە بۆ ئەهلی کوفر دانراوە و تێیکەوتوون {أَمْ يُرِيدُونَ كَيْدًا فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ} (الطور: ٤٢). متمانە بە خوای پەروەدگار و هەنگاونان بە ئیستیعانە بەو(سبحانه وتعالى) خۆی لە خۆیدا هەڵوەشاندنەوەی کرێکانی کوفرە، واتە چۆن کرێکانی ئیسلام کرێ بە کرێ هەڵدەوەشێتەوە، خوای گەورە ئەو یاسا و سونەتانەشی بۆ داناوین کرێکانی کوفریش یەك لە دوای یەك هەڵدەوەشێتەوە، بەڵام پابەند نەبوونی موسڵمان بە ڕوانگەی قورئانەوە بۆ ڕووداوەکان و مامەڵەنەکردنمان لەگەڵ ئەو واقیعە و لەگەڵ ڕووداوەکان بە تەرازووی قورئان و سونەتەوە هۆکاری سەرەکی لاوازی موسڵمانانە، جەرگبڕە کە دەبینێ جەهل بەدینی خوای پەروەردگار لە دەروونی خەڵکانێك تاڕادەیەك قوڵبۆتەوە نیوەی دەق و بەڵگەکان دەبینن و دەیخوێننەوە چاویان ئەوە دەبینێ و دەیخوێننەوە کە خوای پەروەردگار سبحانه وتعالى دەفەرموێ: {وَمَنْ يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ} (لقمان: ٢٢).

بەڵام ئەوە ناخوێننەوە لە تەواوی تەسلیم بوون بۆ خوای گەورە و کردەوەی چاکە کوفرکردنیشە بەتاغوت{لَا إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَدْ تَبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِنْ بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى لَا انْفِصَامَ لَهَا وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ}(البقرة:٢٥٦)

کوفر کردن به تاغوت، خالی کردنی دڵه له هەموو وەلائو خۆشەویستییەك و ئینجا پڕ کردنی ئەو دڵەیە بە تەواوی تەسلیم بوون بۆ خوای گەورە - سبحانه وتعالی- ئەو کات دەستمان گیردەبێ لەو گرێیەی کە ناپسێ و هەڵوەشاندنەوەی بەدەر دەبێ لە توانای مرۆڤ، هەڵوەشاندنەوەی گرێیەکانی ئەو ئیسلامە دانە دانە و یەك بەدوای یەك هۆکاری سەرەکی جەهلە بەدینی خوای پەروەدگار و ناحالی بوونە لەو ئیسلامە, مردنی زانایان و کەمبوونی ئەهلی عیلم و هاتنە پێشی خەلکانێکی نەزان بەزانستی شەرعی هۆکاری هەڵوەشاندنەوەن، واتە ئەو هەڵوەشاندنەوەیە لە فیکر و دەروونی خەلکێکەوە دەستپێدەکات و تەشەنە دەکات بۆ خەلکی تریش، دڵسۆزانی ئەو دینە عالمە عامیلەکان لە هەموو زەمەنێك بەری بیدعەی بیدعەچی و شوبهەی ئەهلی کوفریان گرتووە، واتە چۆن ماندوو بوونە بەوەڵامدانەوەی ئەهلی کوفر و ڕەواندنەوەی گومانەکانیان و ڕوونکردنەوەی ئەو ئیسلامە بۆ ئەو خەلکە ، ئاواش بەلکو زیاتر ماندوو بووینە بە دەمکوت کردنی بیدعەچییەکان، یەکە یەکەی بیدعەکانیان لەگەل بیدعەچییەکان ورد کردۆتەوە و پەنجەیان خسۆتە سەر جەهلەکە و بەلکەکانیشیان خۆستۆتە بەرچاوان.

یەکێك لەو بابەتانەی تاککراوە شێواندراوە و بەردەوامیش دەشێوێندرێ بابەتی گوێرایەلی حاکە، مەنزیلەی حاکم لەئیسلام چییە؟ گوێرایەلی حاکم کەی واجیبە؟ ئەرك و مافی حاکم چییە؟ چەندین پرسیاری تریش لەو بواورەوە دەکرێ ... بەپشتیوانی خوای گەورە (سبحانه وتعالی) هەولدەدەین تیشکی بخەینە سەر ئەو بابەتە و وەلامی ئەهلی عیلم بهێنینەوە بەرچاو لەکاتێکدا بەمەبەست یا بێمەبەست و بەجەهلەوە بۆچوونی زۆرێك لە زانایان لەوبوارەوە شاردراوەتەوە، خوای گەورە پشت و پەنای هەموومان بێت و ئیخلاص و صەوابمان پێببەخشێ.

ئەوەی لەو بابەتە ڕاستە و پێکاومانە بە فەزلی خوای پەرومردگارە(سبحانه وتعالی) وە ئەوەی تێیدا بە هەلەداچووینە و نەمان پێکاوە لێی پەشیمانین و هەموو دەمێکیش ملکەچی بەلگەی صاغ و ڕاستین.

# ئیمامەت لە ئیسلامدا

ئیسلام ڕێکخستنە، ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان تاك و خوای پەروەردکارە، وە ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان تاك و دەوروبەری، ئەوەی مەبەستیەتی خوا بناسێ بەزات و سیفاتە جوانەکانی ئەوا مەتلەبەکەی تەنها لە ئیسلامدا وەدەستدێ، لەبەرئەوەی هەموو ئەو بەرنامە بەشەرییانە نەیانتوانیەوە و ناشتوانن بەبێ گەڕانەوە بۆ کۆتا وەحی بە تەواوی خوای پەروەردگار بناسن، ڕێکخستنی ئەو پەیوەندییەی نێوان مرۆڤایەتی و خوای گەورە (سبحانە وتعالی) تەنها لەڕێی ئیسلامەوە دەبێت هەر لەبەر ئەوەشە {وَمَنْ يَبْتَغِ غَيْرَ الْإِسْلَامِ دِينًا فَلَنْ يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِي الْآخِرَةِ مِنَ الْخَاسِرِينَ}(آل عمران: ٨٥).

هەروەها ئیسلام بەجوانترین شێوە و چاکترین ڕێگە پەیوەندییەکانی نێوان خەلکی ڕێکخستوە بەشێوەیەکی ئاوا گەر تەواوی مرۆڤایەتی کۆببنەوە بۆ دۆزینەوەی بەدیلی ئەو ڕێکخستنە بەبێ هیچ گومانێك ماندوبونەکەیان بۆخۆیان ڕیسوا بوونە و بۆ خەلکیش میحنەت و دەردەسەرییە، موعاناتی خەلکیش لەژێر ئەو سیستەمانەی کە هەلقولاوی فیکری بەشەرن وەك بەدیلێك بۆ ئەو ئیسلامە هێنراوەتە پێش و گەورەترین بەلگەن لەسەر ئەو ڕاستیە.

هەر لەبەر ئەوەشە ئیسلام دینە و دەولەتە، نێوان خۆت و خوای گەورەیە، هەروەکو نێوان خۆت و خەلکییە، ناحالی بوونە لە ئیسلام یا دژایەتی کردنی ئیسلامە هەموو بانگەوازێك بۆ دابڕینی ئیسلام لە واقیع.

لەسەر ئەو بنەمایەوە ئیسلام هاتووە بۆ گۆڕینی واقیع؛ گۆڕینی واقیع و پابەند کردنی بە یاسا، پێویستی بەبوونی کەسێك هەیە چەقی بڕیار بێ و خەلکی لە دەوری کۆببنەوە و لە خزمەتی بەرژەوەندی دین و دونیای ئەو خەلکە بێت، هەر لەبەر ئەوەشە کۆڕای زانایان لەسەر واجب بوونی ئیمامەتە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلی اللە علیە وسلم) دەفەرموێ : [كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الْأَنْبِيَاءُ] (رواه البخاري) واتە:"بەنو ئیسرائیل پێغەمبەران سیاسەتی کردوون، بەمانای سەر پەرشتی کردنیان و بەڕێوبردنی کارەکانیان".

ئیمام (النووي) دەفەرموێ: ((أَيْ يَتَوَلَّوْنَ أُمُورَهُمْ كَمَا تَفْعَلُ الْأُمَرَاءُ وَالْوُلَاةُ بِالرَّعِيَّةِ وَالسِّيَاسَةُ الْقِيَامُ عَلَى الشيء بما يصلحه) (شرح النووي على مسلم ١٢/ ٢٣١ ).

هەروەها ئیمام (ابن حجر) دەفەرموێ: ((تَسُوسُهُمُ الْأَنْبِيَاءُ أَيْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا ظَهَرَ فِيهِمْ فَسَادٌ بَعَثَ اللَّهُ لَهُمْ نَبِيًّا يُقِيمُ لَهُم أَمْرَهُمْ وَيُزِيلُ مَا غَيَّرُوا مِنْ أَحْكَامِ التَّوْرَاةِ وَفِيهِ إِشَارَةٌ إِلَى أَنَّهُ لَا بُدَّ لِلرَّعِيَّةِ مِنْ قَائِمٍ بِأُمُورِهَا يَحْمِلُهَا عَلَى الطَّرِيقِ الْحَسَنَةِ وَيُنْصِفُ الْمَظْلُومَ مِنَ الظَّالِمِ) (فتح الباري لابن حجر ٦/ ٤٩٧). واتە: "هەرکە فەساد لە نێوانیادا سەری هەڵدابا خوای پەروەردگار پێغەمبەرێکی بۆ دەناردن کارەکانی بۆ ڕاست دەکردنەوە و، ئەو گۆ ڕانکاریانەشیان لادەدا کە بەنو ئیسرائیل بەسەر حوکمەکانی تەوراتیان هێنابوو، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی دەبێت کەسێك هەبێت بۆ ڕاستکردنەوەی ئەو خەڵکە و بەرەو ڕاستە ڕێ بردنیان و سەندنەوەی ماف لە کەسی ستەمکار"

شەیخ "عوسەیمین" ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ: ( (وفي قول النبي صلى الله عليه وسلم: [تسوسهم الأنبياء] دليلٌ على أن دين الله- وهو دين الإسلام في كل مكان وفي كل زمان- هو السياسة الحقيقية النافعة، وليست السياسة التي يفرضها أعداء الإسلام من الكفار. السياسة حقيقة ما جاء في شرع الله، ولهذا نقول إن الإسلام شريعة وسياسة، ومن فرق بين السياسة والشريعة فقد ضلّ؛ ففي الإسلام سياسة الخلق مع الله، وبيان العبادات، وسياسة الإنسان مع أهله، ومع جيرانه، ومع أقاربه، ومع أصحابه، ومع تلاميذه، ومع معلميه، ومع كل أحد؛ كل له سياسة تخصه، سياسة مع الأعداء الكفار، ما بين حربيين ومعاهدين ومستأمنين وذميين ))(شرح رياض الصالحين ٣/ ٦٣٦ محمد بن صالح بن محمد العثيمين).

ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دینی خوای پەروەردگار لە هەموو مەکان و زەمانێکا سیاسەتی ڕاستەقینەی بەسود بووە، نەوەك ئەو سیاسەتەی دوژمنانی ئەو ئیسلامە فە ڕزیان کردو وە، سیاسەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کە لە شەرعی خوادا هاتووە، هەر لەبەر ئەوەشە دەڵێین : ئیسلام شەریعەت و سیاسەتە " هەر بۆ ئەو مەبەستە کوێکرە لە کاسێتی ژمارە 3 شەرحی کیتابی (السیاسة الشرعیة/ شەیخ الاسلام إبن تیمیة) شەیخ عوسەیمین بە درێژی باسی ئەو بابەتە دەکات.

کەوابوو دەبێت خەڵکی لە دەوری کەسێك کۆ ببنەوە بۆ جێبەجێکردنی شەرعی خوای گەورە ، هەر بۆیە ئیمام(الماوردي ) دەفەرموێ: (الْإِمَامَة: مَوْضُوعَةٌ لِخِلَافَةِ النُّبُوَّةِ فِي حِرَاسَةِ الدِّينِ وَسِيَاسَةِ

الدُّنْيَا، وَعَقْدُهَا لِمَنْ يَقُومُ بِهَا فِي الْأُمَّةِ وَاجِبٌ بِالْإِجْمَاعِ وَإِنْ شَذَّ عَنْهُمْ الْأَصَمُّ) (الأحكام السلطانية للماوردي ص: ١٥). ئیمامەت لە خیلافەتی نبووەت دانراوە ، واتە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویستمان- صلی الله علیه وسلم- دوا پێغەمبەرە و پێغەمبەری بەدوادا نایەت، تا خۆی مابوو سیاسەتی ئەو خەلکەی دەکرد، بەلام لەدوای ئەو - صلی الله علیه وسلم- ئیمام بەو کارە هەلدەستێ.

کەوا بوو دیاریکردنی کەسێك بۆ سەرپەرشتی و هەلسوڕانی کاروباری خەلکی و پابەند کردنیان بە شەرعی خوای گەورە واجیبە و کۆڕای لەسەرە.

هەر بۆیە ( إبن حزم) دەفەرموێ: ( (اتّفق جَمِيع أهل السّنة وَجَمِيع المرجئة وَجَمِيع الشِّيعَة وَجَمِيع الْخَوَارِج على وجوب الْإِمَامَة وَأن الأمة وَاجِب عَلَيْهَا الانقياد لإِمَام عَادل يُقيم فيهم أَحْكَام الله ويسوسهم بِأَحْكَام الشَّرِيعَة الَّتِي أَتَى بهَا رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم حاشا النجدات من الْخَوَارِج فَإِنَّهُم قَالُوا لَا يلْزم النَّاس فرض الْإِمَامَة وَإِنَّمَا عَلَيْهِم أَن يتعاطوا الْحق بَينهم) ) (الفصل في الملل والأهواء والنحل ٤/ ٧٢) واتە: "ئەهلی سونەت و جەماعەت کۆڕان هەروەکو هەموو مورجیئە و شیعە و خەواریج لەسەر بوونی ئیمام ، مەگەر چەند کەسێکی کەم نەبن لەگەل ئەو کۆڕا بوونە نینە وەکو هەندێك لە خەواریج و موعتەزیلە".

هەر لەو بوارەوە ئیمام "ئەلنەوەوی" دەفەرموێ: ((لَا بُدَّ لِلْأُمَّةِ مِنْ إِمَامٍ يُقِيمُ الدِّينَ، وَيَنْصُرُ السُّنَّةَ، وَيَنْتَصِفُ لِلْمَظْلُومِينَ، وَيَسْتَوْفِي الْحُقُوقَ وَيَضَعُهَا مَوَاضِعَهَا) (روضة الطالبين وعمدة المفتين ١٠/ ٤٢).

## ئامازە بەچەند خاڵێکی گرنگ

## یەکەم: مانای ئیمامەت و خیلافەت.

ئیمامەت واتە پێشەوایەتی کردن، جا بۆ هیدایەت بێت یا بۆ گومرایی، ئیمامیش ئەو کەسەیە کە پێشەوایی دەکات: (والإمامُ: كُلُّ مَنِ ائتَمَّ بِهِ قومٌ كَانُوا عَلَى الصِّرَاطِ الْمُسْتَقِيمِ أَو كَانُوا ضالِّين) (لسان العرب: ١٢/ ٢٤).

ئیمام "ئەلنەوەوی" دەفەرموێ: (يَجُوزُ أَنْ يُقَالَ لِلْإِمَامِ: الْخَلِيفَةُ وَالْإِمَامُ وَأَمِيرُ الْمُؤْمِنِين) (روضة الطالبين وعدة المفتين ١٠/ ٤٩). واتە: "دەکرێ بوترێ خەلیفە یا ئیمام یا ئەمیری ىرواداران " کەواىوو ماناى خەليفە و ماناى ئيمام لەبەرامبەر یەکتریدا هاتوون.

چەمکی ئیمام لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە و ئامارەی وەزیفەی پێکراوە زیاتر نەوەك کەسێکی تایبەتی پێمەبەست بێت، واتە هەنە ئیمام و پێشەوان لە هیدایەت و سەرخستنی ئەو دینە و هەشە ئیمامە و پێشەوایە لە دژایەتی دینی خوای پەروەردگار.

کۆی ئیمام واتە (أَئِمَّةً) لە قورئانی پیرۆز بۆ هەردوو صینف بەکار هات ووە، مەبەست ئەهلی هیدایەت و ئەهلی گومڕایی.

خوای پەروەردگار(سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:{وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَامَ الصَّلَاةِ وَإِيتَاءَ الزَّكَاةِ وَكَانُوا لَنَا عَابِدِين} (الأنبياء: ٧٣)

هەروەها دەفەرموێ: {وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِين} (القصص: ٥). {وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُون} (السجدة: ٢٤). ئەوانەی لەو ئایەتانە ئامارەیان پێکراوە پێشەوای خەیر و هیدایەت و ئیسلامەتین.

ئاواش خەلكێك هەن ئیمامەتی ئەهلی کوفر دەکەن، ئیمامن لە دژایەتی ئەو ئیسلامە و بلاوکردنەوەی فەساد. خوای پەروەردگار دەفەرموێ: {وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُون} (التوبة: ١٢). هەروەها (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: {فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ * وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنْصَرُونَ} (القصص: ٤٠ - ٤١)

بەلام کەر هاتوو لە قورئانی پیرۆز ناوی ئیمام بەتاك هات ئەوا مەبەست لێی پێشەوای کردنە بۆ هیدایەت {وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِين} (البقرة: ١٢٤) هەروەها (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا} (الفرقان: ٧٤).

هۆكاری گومڕابوون زۆره و ورد دەبێته له هەردوو سەرچاوەی سەرەكی ئەو گومڕا بوونه ؛ سەرچاوەی شوبوهات و شەهەوات، بەڵام هیدایەتدان یەك سەرچاوەی هیدایەتی هەیه ، ئەویش تەنها ئیسلامه.

هەر لەو بوارەوە لەقەبی ئەمیری بڕوادارانیش بۆ خەلیفه یاخود ئیمامی گەوره بەكار هاتووه، لەدوای وەفاتی "ئەبو بەكر" ڕەزای خوای گەورەی لەسەر بێ -كه به خەلیفەی پێغەمبەری خوا ناو دەبردرا، صەحابەی كیرام لەقەبی ئەمیری بڕوادارانیان دا به ئیمام "عومەر" ڕەزای خوای لەسەر بێ ((واتّفق أن دعا بعض الصّحابة عمر رضي الله عنه يا أمير المؤمنين فاستحسنه النّاس واستصوبوه ودعوه به)) (تاريخ ابن خلدون ١/ ٢٨٣).

## تێبینییەكی گرنگ:-

لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئیمام و خەلیفه ماناكەیان بەرامبەری یەك بوون، واته خەلیفه هەر خۆشی ئیمام بووه و خەلكی لای فەتواكانی ئەوان وەستاون ، ئەو دوو لەقەبه لەیەك كەس به تەواوی كۆبۆتەوه، هەر بۆ نمونه چاكترین و زاناترین كەس له دوای پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلى الله عليه وسلم) "ئەبو بەكری صەدیق " بووه -ڕەزای خوای لەسەر بێ - دواتر ئیمام "عومەر" و دواتر ئیمام "عوسمان" و دواتر ئیمام "عەلی" ڕەزای خوایان لەسەر بێت، له كەسایەتی ئەوانه هەست بەهیچ جودابونەوەیەك نەكراوه له ئیمامەت و خەلیفایەتی، بەڵام دواتر ئەو دوو مانایه لەیەك جودا دەكرێتەوه. لەقەبی ئیمام زیاتر دەدرێته ئەو كەسانەی كه شارەزایەكی زۆریان لەدین هەبو وهو خەلیفه زیاتر ئیدارەی وولاتی بەدەستەوه بو وه ورده ورده ئەو دوو صیفەته لەیەك جودا دەكرێتەوه ، واته ئیمامەتی دین و ئیمامەتی دونیا، مێژوو ئەوەی بەخۆوه بینیوه خەلكانێك كراون به خەلیفه زۆر بێئاگا بووینه له شەریعەت ، ئیمامەتی ئەوان بەمانای ئیمامەت و خیلافەتی ئیداری و سیاسی هاتووه بۆیه گرنگه بچینه خزمەت ئەو فەرموودەیه

"عَنِ النُّعْمَان بن بشير عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: [تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةٌ عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًا فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ

مُلْكًا جَبْرِيَّةً فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ نُبُوَّةٍ (مشكاة المصابيح ٣/ ١٤٧٨) واتە: "ژیانی پێغەمبەری خۆشەویستمان لە نێوان صەحابەی کیرام مانەوەی نبوەت بووە تا وەفات کردنی(صلی الله علیه وسلم) بە وەفاتی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەرایەتی هەڵگیرا، ئینجا خیلافەت لەسەر ڕێگای پێغەمبەرایەتی ئەوەش ئاماژەیە بۆ خیلافەتی ڕاشیدە، دواتر ئەو خیلافەتە هەڵدەگیرێ و مولکێکی پڕ لە ناڕەحەتی شوێنی دەگرێتەوە و دواتر ئەوەش هەڵدەگیرێ و مولکێکی بە زۆر شوێنی دەگرێتەوە، واتە بەمیراتگرتنی دەسەڵات لەدوای ئەوەش خیلافەت لەسەر مەنهەجی پێغەمبەری خۆشەویست دەگەڕێتەوە".

کەوابوو مانای خەلیفە و ئیمام وردە وردە لەیەك جودا دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو ئاستەی سەرۆك و حاکم دەکەونە ئاقارێك و شەرعی خوای پەروەردگاریش دەکەوێتە ئاقارێکی تر ، کە بێگومان موسڵمان دەبێت لەگەڵ شەرعی خوا بێت، لەو شوێنەی کە شەرعی لێیە و لەگەڵ ئەو کەسەی کە لەسەر شەرعە.

سیستەمی مەلیکایەتی یا بەمیراتگرتنی دەسەڵات شتێکە لەگەڵ ئیسلام تێك نا کاتەوە و لەو سیستەمە ویست و شەهوەتی مەلیك یا بنەماڵە یا قەبیلە زاڵە بەسەر بەرژەوەندی خەڵکی هەنگاوەکان بەرەو ئەو ئاڕاستەیە دەڕوات کە ئەو کەسە مەیلی بۆ دەکا، یا ئەو سیستەمانەی دوور لەشەرعی خواو هەڵقوڵاوی عەقڵی بەشەرن بەپێی عەقڵی خۆیان بەرژەوەندی خەڵکیان دیاریکردووە و دواڕۆژ پشتگوێ خراوە، بەڵام تەنها خیلافەی پێغەمبەرایەتییە بەرژەوەندی دونیا و دواڕۆژی خەڵکی بەپێی شەرعی خوا ڕەچاو کراوە

ئیمام (ابن خلدون) لەو بوارەوە دەفەرموێ: ( (ومقصود الشّارع بالنّاس صلاح آخرتهم فوجب بمقتضى الشّرائع حمل الكافّة على الأحكام الشّرعيّة في أحوال دنياهم وآخرتهم وكان هذا الحكم لأهل الشّريعة وهم الأنبياء ومن قام فيه مقامهم وهم الخلفاء فقد تبيّن لك من ذلك معنى الخلافة وأنّ الملك الطّبيعيّ هو حمل الكافّة على مقتضى الغرض والشّهوة والسّياسيّ هو حمل الكافّة على مقتضى النّظر العقليّ في جلب المصالح الدّنيويّة ودفع المضارّ والخلافة هي حمل الكافّة على مقتضى النّظر الشّرعي في مصالحهم الأخرويّة والدّنيويّة الرّاجعة إليها إذ أحوال الدّنيا ترجع كلّها عند الشّارع إلى اعتبارها بمصالح الآخرة فهي في الحقيقة خلافة عن صاحب الشّرع في حراسة الدّين وسياسة الدّنيا به) (تاريخ ابن خلدون ١/ ٢٣٩).

دووەم:  هەر لێرەوە گرنگە ئاماژە بەوە بکەین کە گوتەی پەنا دەگرین بەخوا لە شەیتان و سیاسەت، لە تەرازووی شەرعدا هیچ سەنگێکی نییە ، بەڵکو ئەوە پێچەوانەی شەرعە و موسڵمان نابێت ئەوەی قبوڵ بێت، ئەو مەفهومە دەبێت تەفصیلی پێبدرێ واتە دەبێت بڵێین پەنا بەخوا دەگرین لە شەیتان و سیاسەتێکی نا ئیسلامی، وە ئەو گوتەیە واتە (اعوذ بالله من الشیطان والسیاسة) پێچەوانەی مەنهەجی پێغەمبەرانە کە خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: [كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ ] (رواه البخاري). شەرعی خوا سیاسەتە بەمانای بەڕێوەبردنی کارو باری خەڵکی و ئیدارەی وڵات.

# ئەرك و مافی "خەلیفە" یا "ئیمام" یا "سوڵتان" یا "حاکم" لە ئیسلامدا

گرنگی وەزیفەی ئیمام لە ئیسلامدا لە خودی وەزیفە و مەقامەکە دایە نەوەك لە خودی کەسەکە ، واتە گرنگ نییە کێ دەکرێتە یا دەبێتە حاکم ؛ گرنگ ئەوەیە ئەوکەسە ئەرکەکانی بەجێ بکەیەنێ و هەدەفەکانی بپێکێ، تاوەکو مافەکانی بپارێزرێ ، حاکم نەهاتۆتە سەر کورسی حوکم بۆ پاراستنی خودی خۆی و کەس و کار و بنەماڵە و قەبیلەی، بەڵکو حاکم لە ئیسلامدا بۆ پاراستنی چەند خاڵێك، حاکە شەرعییەتی بەمانەوەی ئەو خاڵانەیە و شەرعییەت لێ سەندنەوەشی بە نەمانی ئەو خاڵانەیە.

... لە مێژووی ئیسلام دا قەت ئەوە نادۆزیەوە حاکمێك دژایەتی ئیسلامی کردبێ و، زانایان فەتوایان بە گوێڕایەڵی دابێ، بەڵکو سەرەڕای زۆرێك لە زوڵم و فسوقی حاکەکان ، بەڵام پاراستن و پارێزکاری لەو ئیسلامە خاڵی سەرەکی یان بووە، مێژووی ئەو ئیسلامەش گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕاستییە.

... بۆیە دەڵێی: ئەو کەسانە زۆر هەڵەن گەر بێن گوێڕایەڵی بۆ حاکمێك بکەن کە قورئانی لەسەر حوکم لاداوە و دژایەتی ئەو ئیسلامە دەکات، گوێڕایەڵی بۆ ئەو جۆرە حاکە بە بیروبۆچوونی

زانایان بشەرعێنن، کێشەکە لەو تێکەڵ کردنە دایە و، ئەو جۆرە بۆچوونە بیدعەیەکی ترسناکی لێ دەکەوێتەوەو دەبێت پێشی لێ بگیرێ!!

زانایانی ئیسلام باسی مافی کەلیان کردووە لەسەر "ئیمام" یا "خەلیفە" یا "حاکم" واتە لەبەر بوونی ئەو خا لانە شەرعییەتی گوێڕایەڵی پێدراوە ، بە نەمانی ئەو خاڵانە شەرعییەتی گوێ ڕایەڵی لێ دەسەنرێتەوە و توانای گوڕینی بە نەزەری ئیعتبارەوە وەردەگیرێ، لەبەر ئەوەی لە ئیسلامدا هیچ فەرمانێك بەدەر نییە لە توانای مرۆڤ.

ئیمام (أبو عبد الله بدر الدين ابن جماعة) لەکتێبی (تحرير الأحكام في تدبير أهل الإسلام) دوای ئەوەی باسی مافی ئیمام لەسەر خ ەلکی دەکات ، ئینجا باسی ئەو (١٠) مافەی خەڵکی دەکات لەسەر حاکم و دەفەرموێ:

<u>وَأما حُقُوق الرّعية الْعشرَة على السُّلْطَان:</u>

فَالأول: حماية بَيْضَة الإِسْلَام والذب عَنْهَا، إِمَّا فِي كل إقليم إِن كَانَ خَليفَة، أَو فِي الْقطر الْمُخْتَص بِهِ إِن كَانَ مفوضاً إِلَيْهِ، فَيقوم بِجِهَاد الْمُشْركين وَدفع الْمُحَاربين والباغين، وتدبير الجيوش، وتجنيد الْجنُود، وتحصين الثغور بالعدة الْمَانِعَة وَالْعدة الدافعة، وبالنظرِ فِي تَرْتِيب الأجناد فِي الْجِهَات على حسب الْحَاجَات وَتَقْدِير إقطاعهم، وأرزاقهم، وَصَلَاح أَحْوَالهم).

## <u>واتە ئەو (١٠) مافەی خەڵکی لەسەر سوڵتان:</u>

یەکەمیان: پاراستنی ئیسلام و بەرگری کردن لێی.

واتە خاڵی یەکەمی خەلیفە یا سوڵتان پاراستنی ئەو دینەیە، گەر خەلیفە بوو دەبێت دین لە هەموو وڵاتەکانی ژێر دروشمی خیلافەت بپارێزێ، گەر حاکمی وڵاتێکیش بوو دەبێت ئیسلام لەو وڵاتە بپارێزێ کە پێی ڕاسپێردراوە، جیهادی موشریکەکان بکات و خەڵك و وڵات لە ڕێگر و ئاژاوەگێڕان بپارێزێ و ، سەرباز و لەشکر ئامادە بکات و خۆی بۆ ئەو مەبەستە لە هەموو ڕوویەك قایم بکات. واتە پاراستن و پارێزگاری لەو ئیسلامە خەمی یەکەمی حاکە ، بۆیە لە

مێژووی ئیسلامدا قەت ئەوە نادۆزیەوە حاکمێك دژایەتی ئیسلامی کردبێ و زانایان فەتوایان بە کوێرایەلی دابێ، بەلکو سەرەرای زۆرێك لە زولم و فسوقی حاکەکان، بەلام پاراستن و پارێزکاری لەو ئیسلامە خالی سەرەکیان بووە، مێژووی ئەو ئیسلامەش گەورەترین بەلگەیە لەسەر ئەو راستییە.

الْحق الثَّانِي: حفظ الدّين على أُصُوله الْمقررة، وقواعده المحررة، ورد الْبدع، والمبتدعين، وإيضاح حجج الدّين، وَنشر الْعُلُوم الشَّرْعِيَّة، وتعظيم الْعلم وَأَهله، وَرفع مناره وَمحله، ومخالطة الْعلمَاء الأَعْلَام، النصحاء لدين الْإِسْلَام، ومشاورتهم فِي موارد الْأَحْكَام،ومصادر النَّقْض والإبرام. قَالَ الله تَعَالَى لنَبيه صلى الله عَلَيْهِ وَسلم {وشاورهم فِي الْأَمر}.

## مافی دووەمی: خەلکی لەسەر حاکم.

پاراستنی ئەو دینەیە لەسەر بنچینە و بنەما ئەصلیەکانی خۆی، دوور لە هەموو تەحریفێك، واتە حاکم نەك دەبێت رێ لەو کەسانە بکرێت کە دژایەتی ئیسلام دەکەن ، بەلکو دەبێت ئەهلی عیلم لەخۆ نزیك بکاتەوە، تاوەکو بتوانێ لەرێی ئەوانەوە ئەو ئیسلامە وەك خۆی بپارێزێت، حاکم مافی کوێرایەلی لەدەست دەدات، گەر هات و هەولی شێواندن و ناشرین کردنی ئیسلامی دا، پاراستنی ئەو ئیسلامە لەسەر بنچینە و بنەما سەرەکییەکانی خۆی و پوچەلکردنی هەموو هەولێك بۆ لادانی ئەو ئیسلامە لە واقیع، ئەرکی حاکە و زانایانی ئوممەت لەسەری کوران.

الْحق الثَّالِث: إِقَامَة شَعَائِر الْإِسْلَام: كفروض الصَّلَوَات، وَالْجمع وَالْجَمَاعَات، وَالْأَذَان، وَالْإِقَامَة، والخطابة، والإمامة، وَمِنْه النّظر فِي أَمر الصّيام وَالْفطر، وأهلّته، وَحج الْبَيْت الْحَرَام وعمرته. وَمِنْه: الاعتناء بالأعياد، وتيسير الحجيج من نواحي الْبِلَاد، وَإِصْلَاح طرقها وأمنها فِي مَسِيرهمْ، وانتخاب من ينظر أُمُورهم.

## مافی سێیەمی حاکم: جێبەجێ کردنی شەعائری ئەو ئیسلامە.

واتە حاکم نەك تەنها هەر بەقسە بڵێ ئەو ئیسلامە حورمەتی لە حکومەتی من هەیە، بەڵکو دەبێت ئەو قسەیە بە کردەوە بسەلمێنێ، کردنی نوێژە فەرزەکان و جومعە و جەماعەت و بانگدان و قامەت کردن و وتاری هەینی و پێشنوێژی و ڕۆژوو و جەژنەکان و حەج و عومرە و گرنگی دان بە جەژنەکان و ڕێگا خۆشکردن و ئاسانکاری بۆ حەج کردن و... هەموو ئەو کارانە ئەرکی حاکمە دەبێت مشوری بخوات، خەڵکی شیا و ڕاسپاری بۆ ئەنجامدانی ئەو کارانە و، تواناى دەوڵەت بۆ ئەو کارانە مل کەچ بکات.

الْحق الرَّابِع: فصل القضايا وَالْأَحْكَام، بتقليد الْوُلَاة والحكام لقطع المنازعات بَين الْخُصُوم، وكف الظَّالِم عَن الْمَظْلُوم، وَلَا يولي ذَلِك إِلَّا من يَثِق بديانته وأمانته وصيانته من الْعلمَاء والصلحاء، والكفاة النصحاء،وَلَا يدع السُّؤَال عَن أخبارهم والبحث عَن أَحْوَالهم، ليعلم حَال الْوُلَاة مَعَ الرّعية، فَإِنَّهُ مسؤول عَنْهُم، مطَالب بِالْجِنَايَةِ مِنْهُم. قَالَ رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم [كل رَاع مسؤول عَن رَعيته].

مافی چوارەم: لەسەر حاکمە کەسی شیاو و خاوەن دین و ئەمانەت لەلایەن حاکمەوە دیاری بکرێ بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکان و بەرگرتن لە زوڵمی ستەمکار.

سەرەڕای ئەوەش حاکم دەبێ خۆی لێیان بپێچێتەوە ئاگاداری ئەو کەسانە بێت کە کاریانی پێ ڕاسپاردووە

الْحق الْخَامِس: إِقَامَة فرض الْجِهَاد بِنَفسِهِ، وبجيوشه أَو سراياه وبعوثه، وَأَقل مَا يجب فِي كل سنة مرّة إِن كَانَ بِالْمُسْلِمين قُوَّة، فَإِن دعت الْحَاجة إِلَى أَكثر مِنْهُ وَجب بِقدر الْحَاجة، وَلَا يخلي سنة من جِهَاد إِلَّا لعذر كضعف بِالْمُسْلِمين - وَالْعِيَاذ بِاللَّه تَعَالَى - واشتغالهم بفكاك أَسْرَاهُم، واستنقاذ بِلَاد استولى الْكفَّار عَلَيْهَا. وَيبدأ بِقِتَال من يَلِيهِ من الْكفَّار إِلَّا إِذا قَصده الْأَبْعَد، فَيبْدَأ بقتاله لدفعه.

مافی پێنجەم: حاکم لە ئیسلامدا دەبێت خۆی مشوری جیهاد بخوات.

هەر بۆ ئەو مەبەستە سوپا و لەشکر ئامادە بکات، بەلای کەمی ساڵێ یەك جار بەو فەرزە هەڵسێت، بێگومان گەر بارودۆخی موسڵمانان لەبار بوو و بانگەوازی ئیسلامی کۆسپی لەپێش دانرابوو، هەروەها دەبێت حاکم لەخەمی موسڵمانان بێت و گەر موسڵمانان لە دیل دابوون دەبێ هەوڵی کڕینەوەیان یا گۆڕینەوەیان بدات و ئازادیان بکات

الْحق السَّادِس: إِقَامَة الْحُدُود الشَّرْعِيَّة على الشُّرُوط المرعية، صِيَانة لمحارم الله عَن التجريء عَلَيْهَا، ولحقوق الْعباد عَن التخطي إِلَيْهَا. ويسوّي فِي الْحُدُود بَين الْقوي والضعيف، والوضيع والشريف. قَالَ رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم: [إِنَّمَا اهلك من كَانَ قبلكُمْ انهم كَانُوا يُقِيمُونَ الْحُدُود على الوضيع، ويتركون الشريف، وَايْم الله لو آن فَاطمَه بنت مُحَمَّد سرقت لقطع مُحَمَّد يدهَا].

مافی شەشەم: ئەرکی حاکە کە شەرعی خوا بەسەر ئەو خەڵکە بسەپێنێ بۆ پاراستنی سنورەکانی خوای پەروەردگار و پاراستنی مافی خەڵکی.

لەبەر ئەوەی حیکمەت لەو حدودانەی لە ئیسلامدا هاتووە هێنانە دی ئەو دوو خاڵەیە؛ پاراستنی سنوری شەرع و ، پاراستنی مافی خەڵکی . ئەو حدودانەش لە ئیسلامدا هەموو کەس لەبەرامبەری لەیەك ئاستن و چۆن بەسەر هەژارێك دەسەپێنرێ ئاواش بەسەر پادشا و سوڵتان دەسەپێنرێ.

الْحق السَّابِع: جباية الزكوات والجزية من أَهلهَا، وأموال الْفَيْء وَالْخَرَاج عِنْد محلهَا، وَصرف ذَلِك فِي مصارفه الشَّرْعِيَّة، وجهاته المرضية، وَضبط جِهَات ذَلِك، وتفويضه إِلَى الثِّقَات من الْعمَّال.

مافی حەوتەم: کۆکردنەوەی زەکات و جیزیە لەخاوەنەکانی و خەرج کردنی لەشوێنی گونجاوی خۆی بەپێی شەرع ، هەروەها دانانی کەسی شیاو بۆ سەرپەرشتی ئەو کارانە.

الْحق الثَّامِن: النّظر فِي أوقاف الْبر والقربات، وصرفها فِيمَا هِيَ لَهُ من الْجِهَات، وَعمارَة القناطر وتسهيل سبل الْخيرَات.

مافی هەشتەم: دانانی کەسی شیاو بۆ سەر پەرشتی ئەو مولکانەی وەقف کراون و خەرج کردنی داهاتەکان لەرێی شیاو و ئاوەدانکردنەوەی وڵات پێی.

الْحق التَّاسِع: النّظر فِي قسم الْغَنَائِم وتقسيمها، وَصرف أخماسها إِلَى مستحقيها، كَمَا سَيَأْتِي تفصيلها فِي بَاب الْغَنَائِم إِن شَاءَ الله تَعَالَى.

مافی نۆهەم: دابەشکردنی غەنیمە بەو شێوەی شەرع دایناوە.

الحق العاشر: العدل في سلطانه، وسلوك موارده في جميع شأنه. قالَ تَعَالَى {إن الله يأمر بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَان} . وَقَالَ تَعَالَى: {وَإِذا قُلْتُمْ فاعدلوا}.

مافی دەهەم: دادوەری لەحوکم گێڕی و ڕەخساندنی زەمینەیەکی لەبار بۆ عەدالەت لە هەموو بوارەکاندا.

ئەوە بەکورتی ئەو (١٠) خاڵەیە کە مافی خەڵکین بەسەر حاکم و سولتان، وە دەبێت خاوەن دەسەڵات بەو ئەرکانە هەڵسێت. ئەو خاڵانەی ئیمام (إبن جماعة) ئاماژەی پێ فەرمووە لەزۆربەی کتێبەکانی بواری سیاسەی شەرعی دووبارە بۆتەوە ، هەر بۆ نمونە سەیری کتێبی (الأحكام السلطانية / الماوردي) و (الأحكام السلطانية /القاضي أبو يعلى) بکە

کەوابوو حاکم مافی گوێڕایەڵی هەیە بەسەر ئەو خەڵکە ، بەڵام دەبێت ئەو خاڵانە بهێنێتە دی بە تایبەت خاڵی یەکەم و دووەم ، واتە: پاراستنی ئیسلام و پارێزگاری لێکردنی لەسەر بنچینە و بنەما سەرەکییەکانی خۆی و تێکەڵ کردنی بەواقیعی خەڵکی . کە بەو خاڵەش حاکی موسڵمان و حاکی غەیرە موسڵمان لەیەك جودا دەبێتەوە، واتە گەر باسی شەرع بکەین دەبێت ئەوە بەو خەڵکە ڕابگەیەنین کە گوێڕایەڵی حاکم بەپێی شەرع لەسەر ئەو خاڵانەوە سەرچاوەی گرتو وە، ئێمە لێرەدا باسی ئەوە ناکەین گوێڕایەڵی حاکم بەپێی یاسا دەستکردەکان و هەڵقوڵاوی فیکری بەشەر کە بێگومان لەو بەرنامە دەستکردانەش مافی حاکم و مەحکوم دیاریکراوە ، بۆیە دەڵێین: ئەو کەسانە زۆر هەڵەن گەر بێن گوێڕایەڵی بۆ حاکمێك بکەن کە قورئانی لەسەر حوکم لاداوە و دژایەتی ئەو ئیسلامە دەکات، گوێڕایەڵی بۆ ئەو جۆرە حاکە بەبیروبۆچونی زانایان بشەرعێنن، کێشەکە لەو تێکەڵ کردنە دایە و ئەو جۆرە بۆچ وونە بیدعەیەکی ترسناکی لێ دەکەوێتەوەو دەبێت پێشی لێبگیرێ.

دوای زانینی مافی خەڵکی بەسەر حاکم و وەزیفەی حاکم مافی گوێڕایەڵی پێدراوە لەبەر ئەو خاڵانە، بۆیە گەر حاکم بەو خاڵانە هەڵسا ئەوکات ە خەڵکی دەبێت گوێڕایەڵی بکەن . وە زانایان بە (١٠) خاڵ باسی مافی حاکیان کردو وە بەسەر خەڵکی، لێرە لەو کتێبەی ئیمام (إبن جماعة) سەرەتا باسی

مافی حاکی کردووه لەبەر ئەوەی حاکی شەرعی بوونی هەیە و دەولەتی دینی لەئارادا بووە، بەڵام لەو سەردەمەی ئێمە کەلی موسلمان زۆرن و دەولەتی دینی بوونی نییە، ناکرێ لە دەولەتێکی نادینی داوا لەخەلکی بکرێت بەپێی شەرعی خوا هەلسوکەوت لەگەل حاکمێك بکرێت کە خۆی ئەو شەرعەی لە حوکم لاداوە و، تەحاکوم بۆ ئەو شەرعە بە سەدەی تاریك لەقەلەم دەدات خوای گەورە بمانپارێزێ. هەر لەبەر ڕەواندنەوەی ئەو شوبهەیە و بەرگرتن لەو جۆرە بیدعەیە ئێمە سەرەتا باسی مافی خەلکیمان کرد بەسەر حاکم بۆ ئەوەی خەلکی بزانن کامە حاکە بەپێی شەرع گوێڕایەلی واجبیە.

ئیمام (إبن جماعة) دەفەرمووێ: أما حُقُوق السُّلْطَان الْعشرَة: فَالْحق الأول: بذل الطَّاعَة لَهُ ظَاهرا وَبَاطِنا، فِي كل مَا يَأْمر بِهِ أَو يُنْهِى عَنهُ، إِلَّا أَن يكون مَعْصِيَة؛ قَالَ الله تَعَالَى: {يَا أَيهَا الَّذين آمنُوا أطِيعُوا الله وَأَطِيعُوا الرَّسُول وأولي الْأَمر مِنْكُم } وأولو الْأَمر هم: الإِمَام ونوابه عِنْد الْأَكْثَرين. وَقيل: هم الْعلمَاء. وَقَالَ النَّبِي(صلى الله عَلَيْهِ وَسلم): [السّمع وَالطَّاعَة على الْمُسلم فِيمَا أحب أَو كره مَا لم يُؤمر بِمَعْصِيَة ". فقد أوجب الله تَعَالَى وَرَسُوله: طَاعَة ولي الْأَمر، وَلم يستثن مِنْهُ سوى الْمعْصِيَة، فَبَقيَ مَا عداهُ على الِامْتِثَال].

## سەبارەت بەو (١٠) مافەی سوڵتان ئیمام دەفەرمویّ:

یەکەم: گوێڕایەلی کردنی بەنهێنی و ئاشکرا بۆ هەموو فەرمانەکان و نەهییەکانی ، جگە لە شکاندنی فەرمانی خوا(سبحانه وتعالی) خوای پەروەردگار دەفەرموێ :{يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا} (النساء: ٥٩). هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمووێ: [السّمع وَالطَّاعَة على الْمُسلم فِيمَا أحب أَو كره مَا لم يُؤمر بِمَعْصِيَة ] بەپێی ئەو دەقانە گوێڕایەلی حاکی موسلمان واجبیە و سەرپێچی کردنیشی حەرامە.

## ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ:-

خوای پەروەردگار سبحانه وتعالى دەفەرمووێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا} (النساء: ٥٩).

ئەو ئایەتە پیرۆزە بەڵگەیەکی زۆر بەهێزە و قسە برە لەسەر شەرعییەتی گوێڕایەڵی حاکەکان و دەرنەچوون لە فەرمانەکانی، بەڵام زۆرجار کەساتێکی ناحاڵی ئەو ئایەتە دادەبەزێنە سەر واقیعی حاکێك کە هیچ پەیوەندی بەو ئایەتەوە نییە، بۆیە گرنکە بەتێری تیشك بخەینە سەر ئەو ئایەتە بەو ئومێدەی لە چوارچێوەی ڕوونکردنەوەی تەواوی ئەو ئایەتە گومانەکانیش بڕەوێتەوە.

خوای پەرەوەردگار لە ئایەتی پێش ئەوە دەفەرموێ: {إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا} (النساء: ٥٨). خوای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات ئەمانەت بگەیەنینەوە دەست خاوەنەکەی ، وە لەکاتی حوکم دانیشا دادوەر بین، ئەو فەرمانە بۆ موسڵمانە کە حاکیش تاکێکە لە کۆمەڵی ئیسلامی بۆیە موسڵمان موکەلەفە بە دادوەری لە هەموو شتێك و لەگەڵ هەموو کەسێك.

"شەیخ ئەلسەعدی" ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ دەفەرمووێ: ((والمراد بالعدل الذي أمر الله بالحكم به هو ما شرعه الله على لسان رسوله من الحدود والأحكام، وهذا يستلزم معرفة العدل ليحكم به. ولما كانت هذه أوامر حسنة عادلة قال: {إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا} وهذا مدح من الله لأوامره ونواهيه، لاشتمالها على مصالح الدارين ودفع مضارهما، لأن شارعها السميع البصير الذي لا تخفى عليه خافية، ويعلم بمصالح العباد ما لا يعلمون).

ئەو دادوەرییەی کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردو وە گەڕانەوەیە بۆ شەرعی خوای گەورە لە حدود و ئەحکامەکان، واتە عەدالەت بە مەفهومی ئیسلامی ڕەفتار کردن لەگەڵ خەڵکی یا ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان تاك و خوای گەورە، وە ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان تاك و کۆمەڵ لەسەر ئەو بنچینانەی کە خوای گەورە فەرمانی پێکردو وە، ئەوە مانای عەدالەتە، هەرکەسێك تالیبی بنچینە و بنەمای عەدالەت بێ جگە لە ئیسلام، با بێگومان بێ کە نایدۆزێتەوە.

ئینجا لەدوای ئەو وەبیرهێنانەوەیە لەسەر زەرووڕەتی گەڕانەوە بۆ شەرعی خوا و پابەند بوون بە مانای عەدالەت دەفەرموێ: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا} واتە ئەی برواداریەنە ؛ بانگکردنەکە بۆ ئەهلی باوەڕە، هەروەکو لەچەند ئایەتێکی تریش دا بانگی ئەهلی باوەڕی کردو وە وەکو { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ

آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ} (آل عمران: ١٠٢) {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا بِطَانَةً مِنْ دُونِكُمْ لَا يَأْلُونَكُمْ خَبَالًا وَدُّوا مَا عَنِتُّمْ قَدْ بَدَتِ الْبَغْضَاءُ مِنْ أَفْوَاهِهِمْ وَمَا تُخْفِي صُدُورُهُمْ أَكْبَرُ قَدْ بَيَّنَّا لَكُمُ الْآيَاتِ إِنْ كُنْتُمْ تَعْقِلُونَ} (آل عمران: ١١٨) هەروەها خوای پەروەردگار هەموو خەلکیشی بانگ کردووە وەکو: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ} (البقرة: ٢١) {يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُوا مِمَّا فِي الْأَرْضِ حَلَالًا طَيِّبًا وَلَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ} (البقرة: ١٦٨).

هەروەها (جن و ئینس)یشی بانگ کردووە وەکو { يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا لَا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ} (الرحمن: ٣٣).

هەر بانگ کردنێك تایبەتمەندی خۆی هەیە، لەو ئایەتەی کە فەرمان بەگوێڕایەڵی حاکم دەکات ، خوای پەروەردگار بانگی ئەهلی باوەڕی کردووە {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا} ئینجا دەفەرمووێ: {أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ} گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن، وە گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی بکەن، ئینجا دەفەرمووێ: {وَأُولِي الْأَمْرِ مِنْكُمْ} وە خاوەن دەسەڵات لە خۆتان.

.تاعەتی خوای پەروەردگار ئینجا تاعەتی پێغەمبەر(صلی ا لله علیه وسلم) بەڵام تاعەتی حاکم {أطيعوا} ی لەگەڵ نەهاتووە، واتە وا نەهاتووە {واطيعوا اولى الامر منكم} لەبەر ئەوەی تاعەتی حاکم بەستراوەتەوە بەتاعەتی خوای پەروەردگار و پێغەمبەری خۆشەویست، ئینجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: {منكم} واتە نەك موتلەق حاکم ، بەڵکو حاکم لە ئێوە، کە پێشتر بانگی کردوون بەصیفەتی ئیمان. بۆیە بنچینە و بنەمای گشتیە (لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق).

ئینجا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: {فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ} واتە هەر ئیختلافێك لەسەر هەر بابەتێك کەوتە نێوانتان چارەی بکەن بە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویست، ئەو ئایەتە فەرمانە بە گەڕانەوە بۆ قورئان و سوننەت لەکاتی ئیختلاف، وە ئەو گەڕانەوەیەش مەرجی ئیمانە ، بۆیە دەفەرموێ: {إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ} واتە گەر باوەڕتان بە خوای پەروەردگار و پێغەمبەری خۆشەویست هەیە تەحکیمی قورئان و سون نەت بکەن.

هەر بۆیە شەیخ "ئەلسەعدی" دەفەرموێ: ((فالرد إليهما شرط في الإيمان فلهذا قال: {إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ} فدل ذلك على أن من لم يرد إليهما مسائل النزاع فليس بمؤمن حقيقة،

بل مؤمن بالطاغوت، كما ذكر في الآية بعدها {ذَلِكَ} أي: الرد إلى الله ورسوله {خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلا} فإن حكم الله ورسوله أحسن الأحكام وأعدلها وأصلحها للناس في أمر دينهم ودنياهم وعاقبتهم)) (تفسير السعدي - تيسير الكريم الرحمن ص:١٨٣).

كەوابوو جاهیلە ئەو كەسەی ئەو ئایەتە بە بەلگە دەهێنێتەوە بۆ موتلەق حاكم، هیچ كەسێكی دلسۆزیش كومانی لەوەدا نییە كە نیعمەتێكی گەورەیە هەبوونی حاكێكی موسلمان حوكم بەكیتاب و سوننەت بكات و، یەكێتی ریزی موسلمانان بپارێزێ و حورمەتی زانایان و ئەهلی عیلم بگرێ.

هەر لەدوای ئایەتی سەمع و تاعەت بۆ حاكم خوای گەورە دەفەرمووێ: {أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَنْ يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَنْ يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا}

(النساء: ٦٠).

رازی نەبوون بە حوكمی خواو پێغەمبەر و رازی بوون بە یاسا و حوكمی بەرنامە دەستكردەكان بەلگەی ئیدعای باوەرە، نەوەك هەبوونی باوەر لە دلدا، لەبەر ئەوەی گەر حاكم یا مەحكوم رازی نەبوو بەحوكمی ئیسلام، بزانن كە باوەری بەو ئیسلامە نییە، لەبەر ئەوەی باوەر بە ئیسلام بوونە تەحالوم بۆ كیتاب وسونەت.

الحق الثاني: بذل النَّصِيحَة لَهُ سرا وَعَلَانِيَة. قَالَ رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم: [الدِّين النَّصِيحَة" قَالُوا: لمن ؟" قَال لله، وَلِرَسُولِهِ، وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ ] واتە: ((ئاین نەصیحەتە دلسۆزیە بۆ خوای پەروەردگار و بۆ پێغەمبەری خۆشەویست و بۆ سەرەك و حاكمی موسلمان و بۆ هەموو موسلمانان)).

زانایان لەمانای(النصيحة) دەفەرموون: ((الناصِحُ الخالص من العسل وغيره، مثل الناصع. وكل شيئ خلص فقد نصح. وانْتَصَحَ فلانٌ، أي قبل النصيحة ))(الصحاح تاج اللغة) . هەروەها ئیمام ( إبن منظور)دەفەرموێ: ((نَصَحَ الشيءُ: خَلَصَ. والناصِحُ: الْخَالِصُ مِنَ الْعَسَلِ وَغَيْرِهِ. وَكُلُّ شيءٍ خَلَصَ، فَقَدْ نَصَحَ)) (لسان العرب٦١٥/٢) هەروەها ئیمام (إبن فارس) دەفەرموێ: ((نَصَحَ. النُّونُ وَالصَّادُ وَالْحَاءُ أَصْلٌ يَدُلُّ عَلَى مُلَاءَمَةٍ بَيْنَ شَيْئَيْنِ وَإِصْلَاحٍ لَهُمَا)) (مقاييس اللغة ٥/ ٤٣٥) واتە: ((پالافتەی هەنگوین پێی دەوترێ(ناصح)، وە پوختەی هەموو شتێك نوصحە)).

خوای پەروەردگار(سبحانه وتعالی)دەفەرموێ: {لَيْسَ عَلَى الضُّعَفَاءِ وَلَا عَلَى الْمَرْضَى وَلَا عَلَى الَّذِينَ لَا يَجِدُونَ مَا يُنْفِقُونَ حَرَجٌ إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ مَا عَلَى الْمُحْسِنِينَ مِنْ سَبِيلٍ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ} (التوبة: ٩١).

نەك ئەوانەی عوزر دێننەوە، بەڵکو ئەو خاوەن عوزرانەی کە ناتوانن بە کاروانی جیهاد بکەن ئەوانە گوناهیان لەسەر نییە کەرێننەوە بەمەرجی ئەوەی{إِذَا نَصَحُوا لِلَّهِ وَرَسُولِهِ} دڵسۆزبن بۆ خوای پەروەردگار و پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) ، واتە ئەوانە دەبێت هەندە دڵسۆزبن ئاسایشی کۆمەڵ بپارێزن و ببن بەچاوی پاسەوان و یارمەتی دەری کەس و کاری موجاهیدان، کەوابوو نەصیحەت بۆ خوای گەورە پاراستن و کەیاندنی ئاینەکەیەتی و نەصیحەت بۆ پێغەمبەری خۆشەویست( صلی الله علیه وسلم ) کەیاندن و پاراستنی سونەتەکەیەتی.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: [الدِّينُ النَّصِيحَةُ: لِلَّهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ ](رواه البخاري) هەروەها پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ: [الدِّينُ النَّصِيحَةُ» قُلْنَا: لِمَنْ؟ قَالَ: «لِلَّهِ وَلِكِتَابِهِ وَلِرَسُولِهِ وَلِأَئِمَّةِ الْمُسْلِمِينَ وَعَامَّتِهِمْ] (رواه مسلم).

کەوابوو نەصیحەت بۆ خوای گەورە کەیاندن و پاراستنی عیلمی تەوحیدە، یەکتایی لە پەروەردگاری و ئولوهیەت و ناو و صیفەتە جوانەکانی، نەصیحەت بۆ پێغەمبەری خۆشەویست(صلی الله علیه وسلم) پاراستن و کەیاندنی سونەتیەتی، نەصیحەت بۆ کیتابی خوای گەورە کار کردنە بە ئەحکامەکانی، وە نە صیحەت بۆ حاکم و سەرەك و خەلیفەی موسڵمانان بەگوێکردنی و دەرنەچوونە لە دەسەڵاتی لەچوارچێوەی تاعەتی خوای گەورە ، وە نەصیحەت بۆ تەواوی خەڵکی پاراستنی مافیانە و تەعامولە لەگەڵیان لەسەر بنچینەو بنەمای{إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ} (الحجرات: ١٠) وە فەرمودەی خۆشەویستمان: [تَرَى الْمُؤْمِنِينَ فِي تَرَاحُمِهِمْ وَتَوَادِّهِمْ وَتَعَاطُفِهِمْ، كَمَثَلِ الجَسَدِ، إِذَا اشْتَكَى عُضْوًا تَدَاعَى لَهُ سَائِرُ جَسَدِهِ بِالسَّهَرِ وَالحُمَّى](رواه البخاري).

نوصحی حاکم و سەرەك و دڵسۆزی بۆی مافی خۆیەتی ، ئێمە تاوانبارین گەر بەو مافە هەڵنەستین ، زانایان باسی چۆنیەتی وتنی کەلیمەی حەق و نوصحی حاکمیان کرد ووە، کە ئەوەش ئیشی کەسی

دڵسۆز و خاوەن عیلم و حیکمەتە و فە رزی کیفایەتە گەر کۆمەڵێك پێی هەڵسان لەسەر خەڵکی تر لادە چێت، نوصحی حاکم نابێت ببێتە مایەی بە کەمزانین و سوکگردنی وەزیفەی حوکم لەبەرئەوەی نوصح ئاداب و بنچینە و بنەمای خۆی هەیە.

الْحق الثَّالِث: الْقيام بنصرتهم بَاطِنا وظاهراً ببذل المجهود فِي ذَلِك لما فِيهِ نصر الْمُسلمين وَإِقَامَة حُرْمَة الدّين، وكف أَيدي الْمُعْتَدِينَ.

مافی سێیەم: پشتگیری و سەرخستنی حاکم بەنهێنی و ئاشکرا و خۆ ماندو و کردن لەو بوارەوە، لەبەر ئەوەی بوونی حاکم پاراستنی ئەمن و ئاسایشە و سەرخستنی موسڵمانانە و پاراستنی سنوری شەرعە، موسڵمان دەبێت کەسێکیان هەبێ لەدەوری کۆ ببنەوە، ئەو کەسەش ئا ینی بپارێزێ و کێشەکان یەکلا بکاتەوە.

الْحق الرَّابِع: أَن يعرف لَهُ عَظِيم حَقه، وَمَا يجب من تَعْظِيم قدره، فيعامل بِمَا يجب لَهُ من الاحترام وَالْإِكْرَام، وَمَا جعل الله تَعَالَى لَهُ من الإعظام، وَلذَلِك كَانَ الْعلمَاء الْأَعْلَام من أَئِمَّة الْإِسْلَام يعظمون حرمتهم، ويلبون دعوتهم مَعَ زهدهم وورعهم وَعدم الطمع فِيمَا لديهم، وَمَا يَفْعَله بعض المنتسبين إِلَى الزّهْد من قلَّة الْأَدَب مَعَهم، فَلَيْسَ من السّنة

مافی چوارەم: ڕێز و پلەی حاکم بزانرێ و حورمەتی بگیرێ و فەرمانی خوای لەو ڕەچاو بکرێ کە فەرمانی پێکردوین گوێبیستی حاکم بین، هەر لەبەر گرنگی و گەورەیی مافی حاکە زانایان حورمەتی ئەو مەقامەیان پاراستو وە، بۆیە ئیمامەکان قسەکوتن بەسو لتانیان بە پیشەی ئەهلی ئەهواء زانیوە و دوعاکردنیش بۆ سو لتان بەنیشانەی خەیریان زانیوە، هەر لەو بوارەوە (الفضیل کوڕی عیاض) ڕەحمەتی خوای لێبێ فەرمویەتی: (( لو كانت لي دعوة ما جعلتها الا في السلطان )) (رواه شرح السنة للبربهاري ص: ١١٣). ((گەر دوعایەکی قبوڵ کراوم هەبێ بۆ حاکی دەکەم)).

الْحق الْخَامِس: إيقاظه عِنْد غفلته، وإرشاده عِنْد هفوته، شَفَقَة عَلَيْهِ، وحفظاً لدينِهِ وَعرضه، وصيانةً لما جعله الله إِلَيْهِ من الْخَطَأ فِيهِ.

مافی پێنجەم: وشیارکردنەوەی لەکاتی غەفڵەت بوونی، ئەوەش خاڵێکی زۆر گرنگە، هەربۆیە زۆرجار زانایان لە مەجلسی خەلیفە یا والی یاحاکم وەعزیان داوە و خەلیفەیان هێناوەتە گریان، دیارە خەلیفەش دەبێ ئامادەیی هەبێ گوێ لەزانایان بگرێ

"أَبُو مُسْلِمِ الْخَوْلَانِيُّ" ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ‌ دەچێتە خزمەت (مُعَاوِيَةُ بْنِ أبي سفيان) ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێ دەفەرموێ : ((السلام عليك أيها الأَجِيرُ )). (الاجير) بەو کەسە دەوترێ کە لەلایەن کەسێکەوە بە ڕاپەڕاندنی کارێك گیراوە و بەقەت ڕاپەڕاندنی کارەکەی کرێی خۆی وەردەگرێ، ئەو خەلکەی لەوێ ئامادەن دەڵێن : بڵێ سڵاو ی خوات لێبێ ئەمیر(السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا الْأَمِيرُ) ئەویش هەر بە (الاجير) سەلامەکەی لێ دەکا، دوای سێ جار دووبارە کردنەوە ئینجا(مُعَاوِيَةُ) ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ‌ دەفەرموێ: ((دَعُوا أَبَا مُسْلِمٍ فَإِنَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُ )) ((واز لە ئەبو موسلیم بهێنن ئەو خۆی زانا ترە بەوەی دەیڵێ )). ئینجا ئەبو موسلیم دەفەرموێ: ((إِنَّمَا أَنْتَ أَجِيرٌ اسْتَأْجَرَكَ رَبُّ هَذِهِ الْغَنَمِ لِرِعَايَتِهَا؛ فَإِنْ أَنْتَ هَنَأْتَ جَرْبَاهَا، وَدَاوَيْتَ مَرْضَاهَا، وَحَبَسْتَ أُولَاهَا عَلَى أُخْرَاهَا: وَفَّاكَ سَيِّدُهَا أَجْرَكَ، وَإِنْ أَنْتَ لَمْ تَهْنَأْ جَرْبَاهَا وَلَمْ تُدَاوِ مَرْضَاهَا؛ وَلَمْ تَحْبِسْ أُولَاهَا على أخراها عاقبك سيدها )). واتە: ((تۆکرێ گرتەی وەکو ئەو شوانەی بەکرێ دەگیرێ، گەر هاتو ئاگای لە مەڕەکانی هەبوو و نەخۆشەکانی چارەکرد ئەوا ئەو کەسەی کە بەکرێی گرتووە ئەجرەکەی دەداتێ، وە گەر ئاگای لە مەڕەکان نەبوو و نەخۆشەکانی چارە نەکرد ئەوا خاوەنەکەی سزای دەدا )). (بڕوانە: السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية ص: ١١). مەبەست لێرەدا ئەوەیە حاکم دەبێت دڵسۆزانە وە ئاگا بکرێتەوە گەر غەفلەت دایکرت.

الْحق السَّادِس: تحذيره من عَدو يقْصِدهُ بِسوء، وحاسد يرومه بأذى، أَو خارجي يخَاف عَلَيْهِ مِنْهُ، وَمن كل شَيْء يخَاف عَلَيْهِ مِنْهُ على اخْتِلَاف أَنْوَاع ذَلِك وأجناسه، فَإِن ذَلِك من آكِد حُقُوقه وأوجبها .

مافی شەشەمی: گەر هەست کرا دوژمنێك بەرێوەیە بۆ زیان گەیاندن پێی ئەوا دەبێت وشیار بکرێتەوە، یان کەسێکی خەواریج ویستی زیانی پێبگەیەنێ ئەوا دەبێ زوو وشیاری بدرێتێ، پاراستنی خەلیفە یا حاکم لە هەموو جۆرە هەڕەشەیەك بۆ سەر گیانی مافی خۆیەتی بەسەر ئەو خەڵکەوە.

الْحق السَّابِع: إِعْلَامه بسيرة عماله: الَّذين هُوَ مطَالب بهم، ومشغول الذِّمَّة بسببهم لينظر لنفسِهِ فِي خلاص ذمَّته، وللأمة فِي مصَالح ملكه ورعيته.

مافی حەوتەم: دوور نییە خەلیفە یا حاکم لەبەر زۆری مەشغەڵەت نەتوانێ بە تەواوی چاودێری ئەو کەسانەی بکات کە کاری پێ‌ڕاسپاردوون، بۆیە لەکاتی بینینی هەر بێ شەرعییەك لە کاربەدەستێك

دەبێت سەرەتا وشیار بکرێتەوە گەر ئامادەی خۆ چاککردن نەبوو ئەو کات هەواڵ دەدرێتە خەلیفە بۆ چارەی کێشەکە. لەسەردەمی خیلافەی راشیدە خەلیفەکان لەنێو خەلکیدا ژیاون و هەستیان بەکێشەکانی ئەو خەلکە کرد ووە و خۆیان زیاتر نەبینیوە لە کەسێکی ئەو کۆمەڵە، هەر لەبەر ئەوەش متامەنەیان پێکراوە، کاربەدەست ئەو کات سەرە رای ترسی خوای گەورە(سبحانە وتعالی) ترسی ئەوەشی هەبو وە کە خەلیفە یاحاکم حیسابی لەگەل بکات، وە لە هەر ویلایەتێك والیەك بێشەرعی کردبا بەبێ ترس هەوالەکەیان گەیاندۆتە خەلیفە و چارەی کێشەکان کراوە، زۆر جاریش خەلیفە بەبێ کێشە توانیویەتی کاربەدەست بگۆرێ، ئەو جۆرە بابەتانەش زۆرە لە مێژووی ئیسلامدا.

الْحق الثَّامِن: إعانته على مَا تحمله من أعباء الْأمة ومساعدته على ذَلِك بِقدر المكنة، قَالَ الله تَعَالَى {وتعانوا على الْبر وَالتَّقوى} وأحق من أعين على ذَلِك وُلَاة الْأُمُور.

مافی هەشتەم: مافی هەشتەمی خەلیفە بەسەر خەلکیەوە پشتگیری کردنییەتی لەو بارەی کە هەلی گرتووە بەپێی توانا لە پێناو خوای پەروەردگار ، لەسەر بنچینە و بنەمای {وتعانوا على الْبر وَالتَّقوى} وە خەلیفە یاحاکم لە هەموو کەس زیاتر شایستەی ئەو هاوکاری کردنەیە ، واتە موسلمانان هەردەم دلسۆز و هۆکاری سەقامگیرین نەك سەرچاوەی گێرە شێوێنی بن.

الْحق التَّاسِع: رد الْقُلُوب النافرة عَنهُ إِلَيْهِ، وَجمع محبَّة النَّاس عَلَيْهِ؛ لما فِي ذَلِك من مصَالح الْأمة وانتظام أُمُور الْملَّة .

مافی دەیەمی: هەولدان بۆ چاککردنەوەی ئەو دلانەی کە لە خەلیفە شکاوە و گێرانەوەی دلە رەنجاوەکان بۆ ریزی گوێرایەلان، بە رەواندنەوەی گومانەکان و روونکردنەوەی بابەتەکان، وەکو ئەو گفتوگۆیەی(ابن عباس) رەزای خوای لەسەر بێ - لەگەل خەواریجەکانی کرد بۆ گێرانەوەیان بۆ چوارچێوەی خیلافەت.

الْحق الْعَاشِر: الذب عَنهُ بالْقَوْل وَالْفِعْل، وبالمال وَالنَّفس والأهل فِي الظَّاهِر وَالْبَاطِن، والسر وَالْعَلَانِيَة.

مافی دەیەم: پاراستنی خەلیفە و دەرنەچوون لە فەرمانەکانی و پاراستنی یەکێتی ریزی موسلمانان بەنهێنی و بە ئاشکرا.

گەر لە ئیسلامدا حاكم و مەحكوم لەسەر ئەو بنچنیانە لەگەل یەكتر ڕەفتار بكەن، بێگومان دەبێتە هۆكاری پێشكەوتن و بونیاتنانی ژیارێك مۆرڤایەتی لەپێناویا بجەسێتەوە، ئەوە بەكورتی مافەكانی حاكمە لەسەر خەلكی و پێشتریش باس لە مافەكانی خەلكی كرا بەسەر حاكم، وە گرنگە ئەو دید و تێڕوانیە بۆ حاكم و مەحكوم زیاتر لێكۆلینەوەی لسەر بكرێ، ئەو گومانانە ب ڕەویندرێتەوە كە گوایە موسلمانان دژی ئەمن و ئاسایشن و هۆكاری سەقامگیر بوون نین.

دوای ئەوەی بەكورتی باسی ئەرك و مافەكانی حاكم و مەحكوم كرا گرنگە تیشك بخرێت سەر جۆرەكانی حاكم.

چۆن لە كومەل كەسی بڕوادار و موسلمان و كافر بوونی هەیە، هەر بەهەمان شێوە حاكمی بڕوادار و حاكمی موسلمان و حاكمی كافر بوونی هەیە لەژێر هەر بەشێك لەو بەشانە وردەكارییەكی زۆر هەیە و مامەلەی هەر یەكێك لەو حاكمانەش لەگەل ئەوەی تر جودایە، جەهلە بەدینی خوای پەروەدگار مامەلەی حاكمی بڕوادار لەگەل حاكمی موسلمان وە لەگەل حاكمی كافر لەیەك جودا نەكرێتەوە، حاكمێك كە لە حوكمەكەی ئەو شەرعی خوا سەروەرە زۆر جودایە لەگەل حاكمێك دژایەتی شەرعی خوا دەكات و وادەزانێ بەفوی زاری نوری ئەو ئیسلامە دەكوژێتەوە

# جۆرەكانی حاكم

ناسینی جۆرەکانی حاکم و دەسەلات گرنگە بۆ زانینی شێوازی مامەلە کردن لەگەلیدا، لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی خۆشەویستمان(صلی الله علیه وسلم ) ئەوەندە بەلگەی لەسەرە کە هیچ پرسیارێك بێ وەلام نەمێنێتەوە، سەرەڕای ئەوەش زانایان لە شوێنی خۆی تیشکیان خستۆتەسەر ئەو بابەتە.

## یەکەم: دەسەلاتی کافر یا حاکمی کافر:-

زانایان کۆڕان لەسەر کۆڕینی دەسەلاتی کافر یا حاکمی کافر، هیچیش لە بابەتەکە ناگۆڕێ ئەو حاکە کافرە یا ئەو دەسەلاتە کافرە سەرەتا موسلمان بوبێ دواتر وەصفی کوفری هەلگرتبێ، یا هەر لە ئەوەلەوە بەکافری دەستی پێکردبێ.

هەولەکانی "نوح" پێغەمبەر - سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ -گێڕانەوەی تەوحید و گفتوگۆی "موسا" پێغەمبەر-سەلات و سەلامی خوای لەسەر بێ- لەگەل فیرعەون و هەولەکانی بۆ ڕزگارکردنی "بەنو ئیسرائیل" و نەهێشتنی زولمی "فیرعەون"، وە بەسەرهاتی باقی پێغەمبەران سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ - لەگەل قەومەکانیان بەلگەی ڕونن لەسەر ئەو ڕاستییە، هاتنی ئەو ئیسلامە خۆی بۆ خۆی کۆڕینی سیستەمی جاهیلیەتە کە حاکمی کافریش بەشێکی ئەو سیستەمەیە، قسەکردن لەسەر شێوازی کۆ ڕین نییە، قسەکردن لەسەر ئەصلی کۆڕینەکەیە، کە خوای گەورە پێغەمبەری خۆشەویستمانی -صلی الله علیه وسلم - ڕەوانە کرد، قوڕەیشەکان دەیان زانی مانای"لا إله الا الله، محمد رسول الله" گەورەترە لە قسەی زوبان، هەربۆیە ئەوەندە بەتوندی دژی وەستان.

تا ڕووخانی خیلافەت "ئیسلام دەبێ حاکم بێت" جێی گفتوگۆ نەبوو، بەدرێژای مێژووی ئەو ئیسلامەش کەس شەرمی نەکردووە و نەترساوە لە ڕاگەیاندنی کوفری ئەو کەسەی کە حوکمی جگە لە ئیسلامی قبول بووە و پێی ڕازی بووە، هەربۆیە ئیمام "إبن کثیر" کە باسی حوکم کردن بە کتێبەکەی "جەنکیز خان" دەکات دەفەرموێ: ((وَفِي ذَلِكَ كُلِّهِ مُخَالَفَةٌ لِشَرَائِعِ اللهِ الْمُنَزَّلَةِ عَلَى

عِبَادِهِ الْأَنْبِيَاءِ عَلَيْهِمُ الصَّلَاةُ وَالسَّلَامُ، فَمَنْ تَرَكَ الشَّرْعَ الْمُحْكَمَ الْمُنَزَّلَ عَلَى مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ خَاتَمِ الْأَنْبِيَاءِ وَتَحَاكَمَ إِلَى غَيْرِهِ مِنَ الشَّرَائِعِ الْمَنْسُوخَةِ كَفَرَ، فَكَيْفَ بِمَنْ تحاكم إلى الياسا وَقَدَّمَهَا عَلَيْهِ؟ مَنْ فَعَلَ ذَلِكَ كَفَرَ بِإِجْمَاعِ لْمُسْلِمِينَ. قَالَ اللَّهُ تَعَالَى {أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ} (المائدة:٥٠) وَقَال تَعَالى {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجًا مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا} (النساء:٦٥) (البداية والنهاية ١٣/ ١٣٩) )).

ئەوانە هەمووی "کە ئاماژەیە بۆ بڕگە یاساکانی کتێبەکەی جەنکیز خان" پێچەوانەی شەرعی خوایە کە دایەزاندۆتە سەر پێغەمبەرانی -سەڵات و سەلامی خوایان لەسەر بێت - ئەوکەسەی دەستبەرداری شەرعی خوا بێت کە دابەزیوەتە سەر دوا پێغەمبەر "مُحَمَّدِ کوڕی عَبْدِ اللَّهِ" سەڵات و سەلامی خوای لەسەر بێت - و حوکمی شەریعەتەکانی پێشینی قبوڵ بێت کە هەڵوەشێنراونەتەوە کافرە، چ جای ئەوکەسەی کە حوکمی "الياسا/ یاساکانی" جەنگیزخانی قبوڵە و حوکمی پێدەکات، ئەوەی ئەو کارە دەکات کافرە بەکۆڕای زانایان.

هەروەکو خوای پەروەردگار (سبحانە و تعالی) دەفەرموێ: {أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْماً لِقَوْمٍ يُوقِنُونَ} (المائدة: ٥٠) هەروەها دەفەرموێ: {فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّى يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيماً} (النساء: ٦٥).

ئەو حوکمەش واتە حوکمی قبوڵ نەکردنی شەریعەتی خوا و ڕازی بوون بە شەریعەتی بەشەر، حاکم و مەحوکوم دەگرێتەوە . ئەوەش هیچ کاتێك جێی ئیختلاف نەبووە، بۆیە ئەو حاکمەی کە مەبەستیەتی شەریعەتی ئیسلام ڕەشکاتەوە ئەص لەن ئیمامەتی ڕەوا نییە و، گەر بەزۆریش خۆی سەپاند ئەوا واجیبی ئوممەتە لە کورسی دەسەڵات لایبدەن.

ئیمام "النووي" ڕەحمەتی خوای لێبێت دەفەرموێ: ((قَالَ الْقَاضِي عِيَاض أَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَةَ لَا تَنْعَقِدُ لِكَافِرٍ وَعَلَى أَنَّهُ لَوْ طَرَأَ عَلَيْهِ الْكُفْرُ انْعَزَلَ قَالَ وَكَذَا لَوْ تَرَكَ إِقَامَةَ الصَّلَوَاتِ وَالدُّعَاءَ إِلَيْهَا" واتە: "الْقَاضِي عِيَاض" فەرمویەتی: زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە ئیمامەت نابەستری بۆ

کەسێکی کافر، وە کەر هات و کوفری بەسەرا هات لادەدرێ لە حوکم، هەروەها کەر وازی لە نوێژ و بانککردن بۆی هێنا)).

وە دەفەرموێ: ((قَالَ الْقَاضِي فَلَوْ طَرَأَ عَلَيْهِ كُفْرٌ وَتَغْيِيرٌ لِلشَّرْعِ أَوْ بِدْعَةٌ خَرَجَ عَنْ حُكْمِ الْوِلَايَةِ وَسَقَطَتْ طَاعَتُهُ وَوَجَبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْقِيَامُ عَلَيْهِ وَخَلْعُهُ وَنَصْبُ إِمَامٍ عَادِلٍ)) (شرح النووي على مسلم ١٢/ ٢٢٩) کەر کوفر یا بیدعە بەسەر حاکم هات و شەرعی کۆڕی ویلایەتی لەسەر ئەو خەلکە دەکەوێ و کوێڕایەلی ناکرێت و واجبی موسلمانانە لەڕووی بوەستن و بیکۆڕن و ئیمامێکی عادل بهێننە شوێنی.

هەروەها ئیمام "إبن حجر" دەفەرموێ: ((أَنَّهُ يَنْعَزِلُ بِالْكُفْرِ إِجْمَاعًا فَيَجِبُ عَلَى كُلِّ مُسْلِمٍ الْقِيَامُ فِي ذَلِكَ فَمَنْ قَوِيَ عَلَى ذَلِكَ فَلَهُ الثَّوَابُ وَمَنْ دَاهَنَ فَعَلَيْهِ الْإِثْمُ وَمَنْ عَجَزَ وَجَبَتْ عَلَيْهِ الْهِجْرَةُ من تِلْكَ الْأَرْضِ)) (فتح الباري لابن حجر ١٣/ ١٢٣).

واتە حاکم بەکوفر دەبێت لەسەر حوکم لابدرێت و واجبی هەموو موسلمانێکە بەو کارە هەلسێ، ئەوەی توانای بەوە شکا ئەوا پاداشتی هەیە، وە ئەوەی نەرمی نواند ئەوا تاوانبارە، وە کەر هات و ئەو کۆڕینە بەدەر بوو لە دەسەلات، ئەوا موسلمان دەبێت ئەو خاکە جێبهێلێ.

ئەو بۆچونەی ئیمام"إبن حجر" دەربارەی ئەو کەسی بێدەسەلات بۆ هیجرەت کردن لەو شوێنەی کە حاکمی کافر حوکم دەکا، دیارە بۆ ئەو کات کە سنورەکان نەبوون کارێکی ئاسان بوو، بەلام ئێستا لەو زەمەنەی ئەوڕۆ هیجرەت کردن کارێکە بەدەرە لەتوانای خەلکی ، پێوست بە ئارامگرتن و خۆ ئامادەکردن و بوون بەکرۆتینی هەموو هەنگاوێك بۆ ڕووخاندنی حاکمی کافر دەخوازێ.

بەکورتی کۆڕینی ئیمامی کافر و کێڕانەوەی شەرعی خوا جێی ئیختلاف نەبووە و جێبەجێکردنی ئەو حوکە تەنها لە سەر توانای کۆڕین دەوەستێ ، ئەوەش جێی کۆڕای زانایانە مەکەر خاوەن بیدعەیێك پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی هەبێت.

## دووەم: حاکمی موسلمان یا دەسەلاتی ئیسلامی:-

حاکم دەبێت موسلمانێکی عاقلی بالغی ڕەگەز نێری ئازاد و دادپەروەر بێت و بەڕێگای شەرعی هاتبێتە سەر کورسی دەسەڵات، ئەو جۆرە حاکە پشتگیری کردنی واجیبە لەسەر هەموو موسلمانێك و ئەو " ١٠" مافەشی کە هەیە لەسەر ئێمە دەبێت جێبەجێی بکەین. هەموو ئەو فەرمودانەش کە باس لە ماف و گەورەیی حاکم دەکەن لە ئەسلدا بۆ ئەو جۆرە حاکەیە، هەروەکو خۆشەویستمان- صلى الله عليه وسلم - دەفەرموێ: [سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّهِ، يَوْمَ لاَ ظِلَّ إِلاَّ ظِلُّهُ: الإِمَامُ العَادِلُ، وَشَابٌّ نَشَأَ فِي عِبَادَةِ رَبِّهِ، وَرَجُلٌ قَلْبُهُ مُعَلَّقٌ فِي المَسَاجِدِ، وَرَجُلاَنِ تَحَابَّا فِي اللَّهِ اجْتَمَعَا عَلَيْهِ وَتَفَرَّقَا عَلَيْهِ، وَرَجُلٌ طَلَبَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ وَجَمَالٍ، فَقَالَ: إِنِّي أَخَافُ اللَّهَ، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ، أَخْفَى حَتَّى لاَ تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّهَ خَالِيًا فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ] (رواه البخاري) هەوەروەها -صلى الله عليه وسلم - دەفەرموێ: [ثلاثة لا يرد دعاؤهم: الذاكر الله كثيرا و دعوة المظلوم والإمام المقسط] (سلسلة الأحاديث الصحيحة وشيء من فقهها وفوائدها٣/ ٢١١).

بوونی ئەو جۆرە حاکە نیعمەتێکی گەورەی خوای پەروەردگارە و کوێڕایەڵی لە سنو وری شەرع واجیبە و هەموو دەرچوونێکیش لەسەر ئەو جۆرە حاکە خروجە لە دەسەڵاتی ئیسلامی، ڕاپەڕین بەرووی حاکی عادل ئاژاوە گێ ڕیە و نوێکردنەوەی مەنهەجی خەواریجە و لەت کردنی ڕیزی موسلمانانە، کە ئەوەش تاوانێکی گەورەیە و ئەرکی سەرشانی هەموو موسلمانێکە بەپێی توانا بەری ئەو هەوڵە بگرێ.

## سێیەم: حاکمی ستەمکار یان جائر:-

حاکی "جائیر" یا "ستەمکار" ئەو حاکەیە ئیسلام لە دەوڵەتەکەی شەریعەتە و سەروەرە، بەڵام بۆخۆی کەسێکی هەوا ویست و ستەمکارە، واتە کە پێناسەی حاکی جائر دەکرێ نابێت لەڕووی زمانەوانییەوە بەتەنها پێناسەکە بکرێ؛ گەر بە تەنها لەڕووی زمانەوانییەوە پێناسەی حاکی

جائر یا ستەمکار بکەین، ئەوا لادانە لە مەبەستی فوقەها و ئیمامەکان ئەوانەی لەو بوارەوە نوسیویانە و شێواندنی بابەتەکەشە، هەربۆنمونە زانایان قسەیان لەسەر "عَطِيَّةُ السُّلْطَانِ الْجَائِرِ" واتە قبولکردنی بەخشین لە سولتانی زالم وە "التَّقَلُّدُ مِنْ السُّلْطَانِ الْجَائِرِ" قبولکردنی وەزیفە لە سولتانی ستەمکار کردووە، کە مەبەستیان سولتان و حاکم بە پێناسە ئیسلامی و شەرعییەکەی نەوەك تەنها حاکمی ستەمکار لەڕووی زمانەوانییەوە، کە ئەوکات ئەو حاکمانەش دەگرێتەوە کە حوکم بەغەیری بەرنامەی خوا دەکەن، هەر بۆنمونە وەکو حاکمێك کە مارکسیەتی یا دیموکراسی بە بەدیلی قورئان قبولە، خوا بمانپارێزێ.

کەوابوو دەبێت ئەوە بزانین مەبەستمان لە حاکمی جائر و ستەمکار بە پێناسە ئیسلامییەکەیە، ئەو وەصفەش واتە جەور و ستەمکردن و لادان لە دادوەری یا دوای هەڵبژاردنی وەریگرتو وە واتە سەرەتای حوکمی پیاوێکی باش و جێی متمانەی خەڵکی بووە، دواتر فاسق دەبێت و دەبێتە کەسێکی ستەمکار، یا هەر لەسەرەتاوە دەسەڵاتی زەوت کردووە و بەزۆر هاتۆتە سەر حوکم و هەوڵ دەدات دوای خۆشی بۆ کەس و کاری خۆی بیشەرعێنێ.

بەڵام لە هەردوو حاڵەتدا ئەو حاکە حوکم بە شەرعی خوا دەکات و ئیسلام بەرنامەیە و شەرعی خوا لە دادگایەکان سەروەرە، لەسەر گۆڕینی ئەو جۆرە حاکە و ڕاپەڕین بەرویدا ئیختلاف هەیە، گەرچی لە خوێندنەوەی تەفصیلی بۆچوونەکان ڕووبەری ئیختلافەکە زۆر کەم دەبێتەوە.

"جائر" لەزمانی عەرەبی بەمانای لادان لەڕێی ڕاستی دێت، هەروەکو خوای پەروەردگار عزوجل- دەفەرموێ:{وَعَلَى اللَّهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ} النحل:٩

ئیمام "البغوي" دەفەرموێ: ((وَالْقَصْدُ: الصِّرَاطُ الْمُسْتَقِيمُ. وَمِنْهَا جائِرٌ يَعْنِي: وَمِنَ السَّبِيلِ جَائِرٌ عَنِ الِاسْتِقَامَةِ مُعْوَجٌّ )) (تفسير البغوي ٣/ ٧٣) واتە: ((جائر وەصفی ئەو ڕێیە ناڕاستەیە کە خەڵکێك دەیگرنە بەر و لە ڕاستەڕێ دووریان دەخاتەوە)).

ئیمام "أبو هلال العسكري" دەفەرموێ: ((الْفرق بَين الظُّلم والجور" "أَن الْجور خلاف الاسْتِقَامَة فِي الحكم وَفِي السِّيرَة السُّلْطَانِيَّة تَقول جَار الْحَاكِم فِي حكمه وَالسُّلْطَان فِي سيرته إِذا فَارق الاسْتِقَامَة فِي ذَلِك)).

جەور: پێچەوانەی حەق و ڕاستەڕێیە لە حوکم و لە زیانی ڕۆژانەی سوڵتانەکان"وأصل الظُّلم نُقْصَان الْحق"بەڵام ستەم لێخواردن و کەمکردنەوەی حەقە "و خولف بَين النقيضين فَقيل فِي نقيض الظُّلم الانصاف" پێچەوانەی ستەم و جەوریش لە یەکجودان، پێچەوانەی ستەم ئینصافییە؛ بەڵام پێچەوانەی جەور دادوەرییە ((وَهُوَ إِعْطَاء الْحق على التَّمام وَفِي نقيض الْجور الْعدْل وَهُوَ الْعُدُول بِالْفِعْلِ إِلَى الْحق)) (بڕوانە: الفروق اللغوية/أبو هلال العسكري ص: ٢٣١).

بۆیە شەیخ عوسەیمین - ڕەحمەتی خوای لێبێ- دەفەرموێ: ((وليس الجور كما يتصوره بعض الناس الشدة في الحكم، فمن الجور ألا يعدل في الرعية )) واتە: ((جەور توندی لە حوکم نییە وەکو ئەوەی هەندێك لە خەڵکی لێی حاڵی بوون، لە جەورکردنە هەڵسوکەوتێکی نا دادپەروەریانە لە گەڵ خەڵکی)) (بڕوانە: الشرح الممتع على زاد المستقنع ١٤/ ٣٤٢).

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین هیچ ئیمام و زانایەك جەوری حاکمیان قبوڵ نەبووە، هەمووی کۆڕان لەسەر ئەوەی ستەم کردن تاوانێکی گەورەیە، حاکم بیکات یا خەڵکی تر؛ بەڵام جیاوازی لەسەر شێواز و کاتی لادانەکەیە، زۆربەی زۆری ئەو کتێبانەش کە نوسراوە لە کات و سەردەمێکا بووە، دوژمنان چاویان بڕیوەتە خاك و حورمەتی موسڵمانان و ئەو حاکە جائرانەش سنوری ئیسلامیان پاراستووە لەڕووی ئەوان، گەرچی بۆخۆیان سنوریان بەزاندبێ، هەر لەبەر ئەوەش ئیمامەکان قبوڵ کردنی زوڵم و ستەمی حاکی جائریان قبوڵ کردووە نەوەك کارێکی وا بکەن دووبەرەکی دروست ببێت و، وڵات بکەوێتە ژێر دەستی ئەهلی کوفر، بەڵام گەر کرا و بەبێ فیتنە گۆڕدرا و زیانی گۆڕینی کەمتر بوو لەزیانی مانەوەی ئەوا بێگومان هیچ زانایەك نەیان فەرمووە کارێکی خراپە.

ئیمام "إبن حجر" ڕەحمەتی خوای لێبێ - دەفەرموێ: ((وَنقل بن التِّينِ عَنِ الدَّاوُدِيِّ قَالَ الَّذِي عَلَيْهِ الْعُلَمَاءُ فِي أُمَرَاءِ الْجَوْرِ أَنَّهُ إِنْ قَدَرَ عَلَى خَلْعِهِ بِغَيْرِ فِتْنَةٍ وَلَا ظُلْمٍ وَجَبَ وَإِلَّا فَالْوَاجِبُ الصَّبْرُ وَعَنْ بَعْضِهِمْ لَا يَجُوزُ عَقْدُ الْوِلَايَةِ لِفَاسِقٍ ابْتِدَاءً فَإِنْ أَحْدَثَ جَوْرًا بَعْدَ أَنْ كَانَ عَدْلًا فَاخْتَلَفُوا فِي جَوَازِ الْخُرُوجِ عَلَيْهِ وَالصَّحِيحُ الْمَنْعُ إِلَّا أَنْ يَكْفُرَ فَيَجِبُ الْخُرُوجُ عَلَيْهِ)) (فتح الباري لابن حجر ١٣/ ٨).

ئینجا لێرەدا خاڵێکی زۆر گرنگ هەیە دەبێت ئاماژەی پێبکەین؛ زۆرجار دەبینین خەڵکانێك لە هەوڵی ئەوە دان، شەرعییەت بدەن بە مانەوەی حاکمی جائر، کە ئەوەش پێچەوانەی جوملەی ئیمام و زانایانی ئەو ئومەتەیە، ئەص لَ لابردنیەتی و هێنانی حاکمی عادلە، بەڵام بۆ د وورخستنەوەی زیانێکی گەورەتر فەتوا بە گوێرایەڵیان دراوە.

ئینجا نابێت لە مامەڵە کردن لەگەڵ حاکمی فاجیر"المداهنة والمداراة" تێکەڵ بکەین ؛ موداهەنە هەڵسوکەوت و گوفتارە لەگەڵ کەسێك بە پێچەوانەی باوەڕی دڵت بەرامبەر بەو کەسە، یا لەسەر شاردنەوەی حەق و نەگوتنی لەبەر خاتری ئەو کەسە یاکڕینی دونیا بەدین، ئەو جۆرە موداهەنەیە زیاتر لەگەڵ حاکم و دەوڵەمەندان کراوە بۆ ڕازی کردنی دڵیان بەبێ زۆری لێکردن. ئیمام "إبن فارس" دەفەرموێ: ((دَاهَنْتُ الرَّجُلَ، إِذَا وَارَيْتَهُ وَأَظْهَرْتَ لَهُ خِلَافَ مَا تُضْمِرُ لَهُ))(مقاييس اللغة ٢/ ٣٠٨) هەروەها ئیمام "ابن الوزير"دەربارەی جیاوازی موداهەنە و مودارات گو وتەی زانایان دێنێتەوە و دەفەرموێ: ((والفرق بينهما أن ما كان من أمر الدين، مثل أن يفتي بغير الحق، أو يكذب، أو يفعلَ شيئاً من المحرمات، أو يترك شيئاً من الواجبات، فهذه مداهَنَةٌ محرَّمَةٌ)) جیاوازی نێوان ئەو دوو مانایە ئەوەی پەیوەندی بە ئاین هەیە وەکو فەتوا دان بەبێ حەق یا درۆکردن، یا کردنی حەرامێك یا نەکردنی واجبێك ئەو جۆرە موداهەنەیە حەرامە ، واتە کڕینی دونیایە بە دین ((والمداراة بأمور الدنيا، مثل أن تعطيه مالك، أو تُحْسِنَ إليه، فهذه مداراةٌ لا بأس بها)).

بەڵام مودارات وەکو ئەوەی پارەی خۆتی پێببەخشی یا لە مافێکی خۆت خۆش بی ئەو کارە هیچی تیانیه. (بڕوانە: العواصم والقواصم في الذب عن سنة أبي القاسم ٨/ ١٨٦) کەوابوو موداهەنە لەگەڵ حاکمی فاجیر نابێت بکرێ.

# دەرچوون لە دەسەڵاتی حاكمی جائیر و بیروبۆچوونی ئەهلی سونەت و جەماعەت

دەرنەچوون لە دەسەڵاتی حاكمی جائر بەبێ تەفصیل دراوەتە پاڵ بیروبۆچوونی ئەهلی سوننەت و جەماعەت، بە ووردبوونەوە لەو بابەتەش ئەوە ڕوون دەبێتەوە كە ئەو دانە پاڵە ڕەوا نییە، دووورنییە ئەوە بۆچوونی مەزهەبێك بێت لە مەزهەبەكانی ئەهلی سون نەت و جەماعەت نەوەك بەگشتی بۆچوونی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بێت.

بۆیە گرنگە بچینە خزمەت بۆچوونی زانایان لەو بوارەوە و بزانین چییان فەرمووە : ((أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ بَعَثَ جَيْشًا، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ رَجُلًا، فَأَوْقَدَ نَارًا، وَقَالَ: ادْخُلُوهَا، فَأَرَادَ نَاسٌ أَنْ يَدْخُلُوهَا، وَقَالَ الْآخَرُونَ: إِنَّا قَدْ فَرَرْنَا مِنْهَا، فَذُكِرَ ذَلِكَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ لِلَّذِينَ أَرَادُوا أَنْ يَدْخُلُوهَا: [لَوْ دَخَلْتُمُوهَا لَمْ تَزَالُوا فِيهَا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ]، وَقَالَ لِلْآخَرِينَ قَوْلًا حَسَنًا، وَقَالَ: [لَا طَاعَةَ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ، إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ]

دەفەرموێ: ((وَمَعْنَى الْحَدِيثِ لَا تُنَازِعُوا وُلَاةَ الْأُمُورِ فِي وِلَايَتِهِمْ وَلَا تَعْتَرِضُوا عَلَيْهِمْ إِلَّا أَنْ تَرَوْا مِنْهُمْ مُنْكَرًا مُحَقَّقًا تَعْلَمُونَهُ مِنْ قَوَاعِدِ الْإِسْلَامِ فَإِذَا رَأَيْتُمْ ذَلِكَ فَأَنْكِرُوهُ عَلَيْهِمْ وَقُولُوا بِالْحَقِّ حَيْثُ مَا كُنْتُمْ)) واتە: ((دووبەرەكی لەگەڵ كاربەدەست مەكەن لە دەسەڵاتەكەی و بەگژیاندا مەڕۆن ، مەگەر مونكەرێكی ئاشكراتان بینی و بەچاكی دەزانن كە ئەوە لە بنەماكانی ئیسلامە، گەر ئەوەتان بینی ئینكاری بكەن و لە هەر كوێ بن قسەی حەق بكەن)).

((وَأَمَّا الْخُرُوجُ عَلَيْهِمْ وَقِتَالُهُمْ فَحَرَامٌ بِإِجْمَاعِ الْمُسْلِمِينَ وَإِنْ كَانُوا فَسَقَةً ظَالِمِينَ وَقَدْ تَظَاهَرَتِ الْأَحَادِيثُ بِمَعْنَى مَا ذَكَرْتُهُ وَأَجْمَعَ أَهْلُ السُّنَّةِ أَنَّهُ لَا يَنْعَزِلُ السُّلْطَانُ بِالْفِسْقِ)).

بەڵام دەرچوون لە دەسەڵاتیان و شەر لەگەڵیان ئەوە حەرامە بە كۆڕای موسڵمانان گەر فاسیق و ستەمكاریش بن ، فەرموودەی زۆریش لەسەر ئەو مانایە هەیە، ئەهلی سون نەت و جەماعەتیش كۆڕان لەسەر ئەوەی سوڵتان بەفیسق لانابردرێ.

((وَأَمَّا الْوَجْهُ الْمَذْكُورُ فِي كُتُبِ الْفِقْهِ لِبَعْضِ أَصْحَابِنَا أَنَّهُ يَنْعَزِلُ وَحُكِيَ عَنِ الْمُعْتَزِلَةِ أَيْضًا فَغَلَطٌ مِنْ قَائِلِهِ مُخَالِفٌ لِلْإِجْمَاعِ)).

وە دەربارەی ئەو بۆچوونەی لە کتێبە فیقهییەکان هاتووە لە هاو مەزهەبەکانمان بەوەی کە لادەبردرێ هەروەکو لە موعتەزیلەش واگێردراوەتەوە, ئەوەش هەڵەیە و پێچەوانەی ئیجماعە.

((قَالَ الْعُلَمَاءُ وَسَبَبُ عَدَمِ انْعِزَالِهِ وَتَحْرِيمِ الْخُرُوجِ عَلَيْهِ مَا يَتَرَتَّبُ عَلَى ذَلِكَ مِنَ الْفِتَنِ وَإِرَاقَةِ الدِّمَاءِ وَفَسَادِ ذَاتِ الْبَيْنِ فَتَكُونُ الْمَفْسَدَةُ فِي عَزْلِهِ أَكْثَرَ مِنْهَا فِي بَقَائِهِ)).

زانایان فەرموویانە هۆکاری لانەبردنی و حەرام کردنی دەرچوون لە دەسەڵاتی ئەو فیتنە و خوێن ڕشتنە و تێکدانی نێوان خەڵکییە کە لێیدەکەوێتەوە، ئەوکات مەفسەدەی لادانی گەورەتر دەبێت لە مەفسەدەی مانەوەی.

((قَالَ الْقَاضِي عِيَاضٌ أَجْمَعَ الْعُلَمَاءُ عَلَى أَنَّ الْإِمَامَةَ لَا تَنْعَقِدُ لِكَافِرٍ وَعَلَى أَنَّهُ لَوْ طَرَأَ عَلَيْهِ الْكُفْرُ انْعَزَلَ)). قازی عیاز فەرم وویەتی: ((زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی ئیمامەت نابەستڕێ بۆ کەسی کافر، وە گەر هات و کوفری بەسەر هات لا دەبردرێ)).

ئینجا دەفەرموێ: ((قَالَ الْقَاضِي فَلَوْ طَرَأَ عَلَيْهِ كُفْرٌ وَتَغْيِيرٌ لِلشَّرْعِ أَوْ بِدْعَةٌ خَرَجَ عَنْ حُكْمِ الْوِلَايَةِ وَسَقَطَتْ طَاعَتُهُ وَوَجَبَ عَلَى الْمُسْلِمِينَ الْقِيَامُ عَلَيْهِ وَخَلْعُهُ وَنَصْبُ إِمَامٍ عَادِلٍ إِنْ أَمْكَنَهُمْ ذَلِكَ )). قازی عیاز فەرمویەتی: ((گەر هات و حاکم کوفری بەسەرا هات و شەرعی گۆڕی ، یان بیدعەیەکی بەسەر داهات "کە مەبەست ئەو بیدعە گەورانەیە قەواعیدی ئیسلام دەگۆ ڕێ نەك موتلەق بیدعە، والله اعلم" ئەوکات لە حوکمی ویلایەت لادەبردرێ و گوێڕایەڵی لەسەر خەڵکی لادەچێت و، واجبی موسڵمانانە ڕاپەڕین بەڕوویدا، وە گۆڕینی و هێنانی ئیمامێکی عادل گەر بۆیان کرا)).

((فَإِنْ لَمْ يَقَعْ ذَلِكَ إِلَّا لِطَائِفَةٍ وَجَبَ عَلَيْهِمُ الْقِيَامُ بِخَلْعِ الْكَافِرِ وَلَا يَجِبُ فِي الْمُبْتَدِعِ إِلَّا إِذَا ظَنُّوا الْقُدْرَةَ عَلَيْهِ فَإِنْ تَحَقَّقُوا الْعَجْزَ لَمْ يَجِبِ الْقِيَامُ وَلْيُهَاجِرِ الْمُسْلِمُ عَنْ أَرْضِهِ إِلَى غَيْرِهَا وَيَفِرَّ بِدِينِهِ)). گەر

هات و ئەوە نەكرا تەنها بەكەسانێك نەبێت ئەوا لەسەریان دەبێتە واجیب "واتە گۆڕینی حاكە كافرەكەیە" بەڵام سەبارەت بە حاكی بیدعەچی نابێتە واجیب، تەنها لەوكاتەی باوەڕیان لا دروست دەبێت كە توانای گۆ ڕینیان هەیە، گەر زانیان پێیان ناكرێ بیگۆڕن ئەوا نابێتە واجیب و با موسڵمان لەو شوێنە هیجرەت بكا و، دینی خۆی ڕزگار بكا.

((قَالَ وَلَا تَنْعَقِدُ لِفَاسِقٍ ابْتِدَاءً فَلَوْ طَرَأَ عَلَى الْخَلِيفَةِ فِسْقٌ قَالَ بَعْضُهُمْ يَجِبُ خَلْعُهُ إِلَّا أَنْ تَتَرَتَّبَ عَلَيْهِ فِتْنَةٌ وَحَرْبٌ)). هەروەها قازی عیاز فەرمویەتی: ((كەسی فاسیق هەر لە سەرەتاوە ناكرێ بە ئیمام، وە گەر هات و خەلیفە بوو بە فاسیق ، هەندێك فەرموویانە دەبێت لابدرێ ، مەگەر شەڕو ئاژاوەی لێبكەوێتەوە)).

((وَقَالَ جَمَاهِيرُ أَهْلِ السُّنَّةِ مِنَ الْفُقَهَاءِ وَالْمُحَدِّثِينَ وَالْمُتَكَلِّمِينَ لَا يَنْعَزِلُ بِالْفِسْقِ وَالظُّلْمِ وَتَعْطِيلِ الْحُقُوقِ وَلَا يُخْلَعُ وَلَا يَجُوزُ الْخُرُوجُ عَلَيْهِ بِذَلِكَ بَلْ يَجِبُ وَعْظُهُ وَتَخْوِيفُهُ لِلْأَحَادِيثِ الْوَارِدَةِ فِي ذَلِكَ)) بەڵام زۆربەی زۆری ئەهلی سون ـەت و جەماعەت لە فەقیهو فەرموودەناس و موتەكەلیمەكان فەرموویانە بە فیسق و زوڵم و پەكخستنی مافەكان خەلیفە لا نابردرێ و ، جائیزیش نییە دەرچوون لە دەسەڵاتی، بەڵكو دەبێت وەعز بدرێت و بترسێنرێ لەبەر ئەو فەرموودانەی لەو بوارەوە هاتوون.

((قَالَ الْقَاضِي وَقَدِ ادَّعَى أَبُو بَكْرِ بْنُ مُجَاهِدٍ فِي هَذَا الْإِجْمَاعَ وَقَدْ رَدَّ عَلَيْهِ بَعْضُهُمْ هَذَا بِقِيَامِ الحسن وبن الزُّبَيْرِ وَأَهْلِ الْمَدِينَةِ عَلَى بَنِي أُمَيَّةَ وَبِقِيَامِ جَمَاعَةٍ عَظِيمَةٍ مِنَ التَّابِعِينَ وَالصَّدْرِ الْأَوَّلِ عَلَى الحجاج مع بن الأشعث وتأول هذا القائل قوله أن لا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ فِي أَئِمَّةِ الْعَدْلِ وَحُجَّةُ الْجُمْهُورِ أَنَّ قِيَامَهُمْ عَلَى الْحَجَّاجِ لَيْسَ بِمُجَرَّدِ الْفِسْقِ بَلْ لِمَا غَيَّرَ مِنَ الشَّرْعِ وَظَاهَرَ مِنَ الْكُفْرِ قَالَ الْقَاضِي وَقِيلَ إِنَّ هَذَا الْخِلَافَ كَانَ أَوَّلًا ثُمَّ حَصَلَ الْإِجْمَاعُ عَلَى مَنْعِ الْخُرُوجِ عَلَيْهِمْ وَاللَّهُ أَعْلَمُ )) (بڕوانە: شرح النووي على مسلم ١٢/ ٢٤٤).

قازی عیاز فەرمویەتی: ((ئەبوبەكر كوڕی موجاهید باس لە كۆڕای زانایان دەكات لەسەر ئەوە، وە هەندێك وەڵامیان داوەتەوە "واتە ئەو بۆچوونەی كە دەڵێ كۆڕای زانایان لەسەر دەرنەچوون نییە"

و باسی ڕاپەڕینەکەی ئیمام حوسەین و عەبدوڵای کوڕی زوبەیر و ئەهلی مەدینەیان کردووە لە دەسەڵاتی بەنی ئومەیە، وە ڕاپەڕینی خەڵکێکی یەکجار زۆر لە تابعییەکان لەگەڵ عەبدولڕەحمانی کوڕی ئەشعەس بەڕووی حەجاج وە دەربارەی "أن لا نُنَازِعَ الْأَمْرَ أَهْلَهُ" کێشە دروست نەکردن لەسەر دەسەڵات لەگەڵ خاوەن دەسەڵات فەرموویانە ئەوە تایبەتە بە ئیمامە عادیلەکان ، بەڵام بەلگەی زۆرینە واتە"الجمهور" ئەوەیە ڕاپەڕین بەڕووی حەجاج تەنها لەبەر فیسقی حەجاج نەبووە، بەڵکو لەبەر ئەو گۆڕانانەی بووە کە بەسەر شەرعی داهێنا.

لەو چەند دێڕەی ئیمام "النووي" کە قسەکانی لە قازی عیاز نەقل کردووە زۆر ڕوونە کە دەرچوون لەسەر حاکمی فاجیر، ڕا و بۆچوونی تریشی لەسەر هەبووە ، واتە ئیمام و زانای تر هەبووینە بۆچوونی تریان هەبووە لەسەر ئەوە و نابێت موتڵەق دەرنەچوون بکرێت بەڕای تەواو. ئینجا ئیمام "النووي" لەشەرحی ئەو فەرموودەیە دەفەرموێت: [خِيَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُحِبُّونَهُمْ وَيُحِبُّونَكُمْ، وَيُصَلُّونَ عَلَيْكُمْ وَتُصَلُّونَ عَلَيْهِمْ، وَشِرَارُ أَئِمَّتِكُمُ الَّذِينَ تُبْغِضُونَهُمْ وَيُبْغِضُونَكُمْ، وَتَلْعَنُونَهُمْ وَيَلْعَنُونَكُمْ ]. چاکترینی ئیمامەکانتان ئەوانەن کە خۆشتان دەوێن و ئێوەیان خۆش دەوێت ، وە دوعایان بۆ دەکەن و دوعاتان بۆ دەکەن، وە خراپترینی ئیمامەکانتان ئەوانەن کە ڕقتان لێیانە و ئەوانیش ڕقیان لە ئێوەیە، وە بەلەعنەتیان دەکەن و بە لەعنەتتان دەکەن [قِيلَ: يَا رَسُولَ اللهِ، أَفَلَا نُنَابِذُهُمْ بِالسَّيْفِ؟ فَقَالَ: «لَا، مَا أَقَامُوا فِيكُمُ الصَّلَاةَ، وَإِذَا رَأَيْتُمْ مِنْ وُلَاتِكُمْ شَيْئًا تَكْرَهُونَهُ، فَاكْرَهُوا عَمَلَهُ، وَلَا تَنْزِعُوا يَدًا مِنْ طَاعَةٍ] گوترا ئەی پێغەمبەری خوا -صلى الله عليه وسلم - دەست نەدەینە شمشێر لە ڕوویان؟ ئەوی- صلى الله عليه وسلم- فەرمووی: نەخێر تا نوێژتان بۆ بکەن؟ وە گەر خراپەتان لە خاوەن دەسەڵات بینی و ڕقتان لە کردەوەکەی بێتەوە، دەستتان لە گوێڕایەڵی مەکێشنەوە.

ئینجا ئیمام "النووي" دەفەرموێ: ((بمجرد الظلم أو الفسق مالم يغيروا شيئا من قواعد الإسلام)) لە گوێڕایەڵی دەرمەچن تەنها لەبەر زوڵم و فیسقی حاکم ، بەومەرجەی هیچ بنچینە و بنەمای ئیسلامیان نەگۆڕیبێ.

ئەوەی گرنگە لێرەدا:

یەکەم: هەر کاتێك بنچینە و بنەمای ئەو ئیسلامە هەڵوەشێنرایەوە و شێواندرا، واجیبی سەرشانی موسڵمانە ئەو ڕژێمە بگۆڕێ بەپێی توانای.

دووەم: گێڕانەوەی قسەکانی قازی عیاز - ڕەحمەتی خوای لەسەر بێ - لەلایەن ئیمام "النووي" بەڵگەی ئەوەیە وەکو باسمان کرد ، بۆچوونی تریش هەبووە سەبارەت بە دەرچوون لە دەسەڵاتی حاکمی فاجیر.

سێیەم: ئیمام "النووي" قسەی هەندێك زانایان دێنێتەوە کە دەرچوون لەسەر "حەجاج"یان بەڕەوا زانیوە لەبەرئەوەی وتویانە "حەجاج" بنچینە و بنەمانی ئیسلامی گۆڕیوە. دەرچوونیان بەڕەوا زانیوە سەرەڕای ئەو هەموو فتوحاتەی کە لەسەردەمی حەجاج کرا.

هەر بۆیە سەرم سوڕماوە کەسانێك ئەوڕۆ فەتوا بە حەرام کردنی دەرچوون لە دەسەڵاتی حوکامێك دەدەن زۆر زاڵم تر لە "حەجاج" و کافر تر لە "فیرعەون"، نەك لەبەرئەوەی گۆڕینیان لە توانا و دەسەڵاتی ئەو خەڵکە نییە و، هەوڵی گۆڕینیان خوێنێکی زۆری لێ دەکەوێتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی دەرچوون لە دەسڵاتی حاکمیان پێ جائیز نییە؟!! کە ئەوە بەڕاستی بدعەیە کە هەموو چاکسازی و فەرمان بە چاکە و قەدەغەکردنی خراپە دەڕوخێنێ.

دووەم: ئیمام جەصاص "أحمد بن علي الرازي الجصاص ٣٠٥ـ ٣٧٠" لە مانای ئەو ئایەتە {وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ} [سورة البقرة: ١٢٤].

دەفەرموێ: ((وَدَلَّ أَيْضًا عَلَى أَنَّ الْفَاسِقَ لَا يَكُونُ حَاكِمًا وَأَنَّ أَحْكَامَهُ لَا تَنْفُذُ إذَا وَلِيَ الْحُكْمَ وَكَذَلِكَ لَا تُقْبَلُ شَهَادَتُهُ وَلَا خَبَرُهُ إذَا أَخْبَرَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَا فُتْيَاهُ إذَا كَانَ مُفْتِيًا وَأَنَّهُ لَا يُقَدَّمُ لِلصَّلَاةِ وَإِنْ كَانَ لَوْ قُدِّمَ وَاقْتَدَى بِهِ مُقْتَدٍ كَانَتْ صَلَاتُهُ مَاضِيَةً فَقَدْ حَوَى قوله لا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ هَذِهِ الْمَعَانِي كُلَّهَا)) ئەو ئایەتە بەڵگەی ئەوەشە کە کەسی فاسیق نابێ بکرێ بەحاکم، وە حوکمەکانی جێبەجێ ناکرێ گەر کرا بە حاکم هەروەکو شایەتی قبوڵ ناکرێ و خەبەری وەرناگیرێ

کەر شتێکی گێڕایەوە لە پێغەمبەر -صلی الله علیه وسلم- وە فەتوای قبوڵ ناکرێ کەر موفتی بێت و پێش ناخرێت بۆ پێشنوێژی کەرچی هات و پێشخرا نوێژی ئەوانەی دواوەی دروستە "مەبەستی ئیمام ئەوەیە کە ئەصڵەن نابێت پێشخرێ".

ئینجا دەفەرموێ: ((وَمِنَ النَّاسِ مَنْ يَظُنُّ أَنَّ مَذْهَبَ أَبِي حَنِيفَةَ تَجْوِيزُ إِمَامَةِ الْفَاسِقِ وَخِلَافَتِهِ وَأَنَّهُ يُفَرِّقُ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْحَاكِمِ فَلَا يُجِيزُ حُكْمَهُ وَذُكِرَ ذَلِكَ عَنْ بَعْضِ الْمُتَكَلِّمِينَ وَهُوَ الْمُسَمَّى زُرْقَانَ وَقَدْ كَذَبَ فِي ذَلِكَ وَقَالَ بِالْبَاطِلِ وَلَيْسَ هُوَ أَيْضًا مِمَّنْ تُقْبَلُ حِكَايَتُهُ وَلَا فَرْقَ عِنْدَ أَبِي حَنِيفَةَ بَيْنَ الْقَاضِي وَبَيْنَ الْخَلِيفَةِ فِي أَنَّ شَرْطَ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمَا الْعَدَالَةُ وَأَنَّ الْفَاسِقَ لَا يَكُونُ خَلِيفَةً وَلَا يَكُونُ حَاكِمًا كَمَا لَا تُقْبَلُ شَهَادَتُهُ وَلَا خَبَرُهُ لَوْ رَوَى خَبَرًا عَنْ النبي صلّى الله عليه وسلم وَكَيْف يَكُونُ خَلِيفَةً وَرِوَايَتُهُ غَيْرُ مَقْبُولَةٍ وَأَحْكَامُهُ غَيْرُ نَافِذَةٍ)).

خەلکانێك هەن وای بۆچوون کە مەزهەبی ئیمام "ئەبو حەنیفە" ڕێ بە ئیمامەت و خیلافەتی کەسی فاسیق داوە، ئەوەش لەڕاستیدا ڕاست نییە و لای ئیمام "ئەبو حەنیفە" جیاوازی نێوان قازی و خەلیفە نییە لە مەرجی عەدالەت. کەسی فاسیق نابێتە خەلیفە و حاکم هەروەکو شایەتی و خەبەری قبوڵ ناکرێت، ئەو کەسە چۆن دەکرێت بە خەلیفە کە ڕیوایەتی قبوڵ نییە و حوکەکانی جێبەجێ ناکرێن.

((وَكَيْف يَجُوزُ أَنْ يُدَّعَى ذَلِكَ عَلَى أَبِي حَنِيفَةَ وَقَدْ أَكْرَهَهُ ابْنُ هُبَيْرَةَ فِي أَيَّامِ بَنِي أُمَيَّةَ عَلَى الْقَضَاءِ وَضَرَبَهُ)).

چۆن دەبێ ئەوە "واتە ڕێپێدان بە ئیمامەت و خیلافەتی کەسی فاسیق" بدرێتە پاڵ ئیمام "ئەبو حەنیفە" کە خۆی لە سەردەمی بەنو ئومەیە گیرا لەسەر قبوڵ نەکردنی قازیاتی"

ئینجا دەفەرموێ: ((وَكَانَ مَذْهَبُهُ مَشْهُورًا فِي قِتَالِ الظَّلَمَةِ وَأَئِمَّةِ الْجَوْرِ)) واتە: ((مەزهەبی ئیمام ئەبو حەنیفە مەشهور بوو لە شەر کردن دژ بە ستەمکار و ئیمامە جائیرەکان)).

ئینجا دەفەرموێ: ((وَقَدْ كَانَ الْحَسَنُ وَسَعِيدُ بْنُ جُبَيْرٍ وَالشَّعْبِيُّ وَسَائِرُ التَّابِعِينَ يَأْخُذُونَ أَرْزَاقَهُمْ مِنْ أَيْدِي هَؤُلَاءِ الظَّلَمَةِ لَا عَلَى أَنَّهُمْ كَانُوا يَتَوَلَّوْنَهُمْ وَلَا يَرَوْنَ إمَامَتَهُمْ وَإِنَّمَا كَانُوا يَأْخُذُونَهَا عَلَى أَنَّهَا حُقُوقٌ لَهُمْ فِي أَيْدِي قَوْمٍ فَجَرَةٍ)). واتە: ((هەموو ئەوانە ڕەحمەتی خوایان لێبێ، بەشی خۆیان لە دەسەڵات وەردەگرت نەك لەبەر ئەوەی وەلایان بۆ دەسەڵات هەبووە، بەڵكو وەرگرتنی بەشیان بە مافی خۆیان دەزانی لای دەسەڵاتداران)).

((وَكَيْفَ يَكُونُ ذَلِكَ عَلَى وَجْهِ مُوَالَاتِهِمْ وَقَدْ ضَرَبُوا وَجْهَ الْحَجَّاجِ بِالسَّيْفِ وَخَرَجَ عَلَيْهِ مِنْ الْقُرَّاءِ أَرْبَعَةُ آلَافِ رَجُلٍ هُمْ خِيَارُ التَّابِعِينَ وَفُقَهَاؤُهُمْ فَقَاتَلُوهُ مَعَ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ مُحَمَّدِ بْنِ الْأَشْعَثِ بِالْأَهْوَازِ ثُمَّ بِالْبَصْرَةِ ثُمَّ بِدَيْرِ الْجَمَاجِمِ مِنْ نَاحِيَةِ الْفُرَاتِ بِقُرْبِ الْكُوفَةِ وَهُمْ خَالِعُونَ لِعَبْدِ الْمَلِكِ بْنِ مَرْوَانَ ))
واتە:((ئەوانە بوون شمشێریان لە ڕووی حەجاج ڕاكێشا و چوار هەزار كەس لە چاكترینی تابعییەكان شەڕیان دژی حەجاج كرد و لە كوێرایەڵی عەبدولمەلیكی كوڕی مەڕوان دەرچوون )).
(بڕوانە: أحكام القرآن للجصاص ١ / ٨٨).

كەوابوو ئیمام "جەصاص" ڕەحمەتی خوای لێبێ - وەڵامی ئەوانە دەداتەوە كە وای بۆ چوون كە نابێت خەڵكی ڕاپەڕن بەڕووی حاكمی فاجیر بەڵگەكانیشی زۆر بەقوەتن و ، هەڵوێستەكانی ئیمام "ئەبو حەنیفە" ش زۆر ڕوونە لەو بوارەوە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ.

سێیەم: ئیمام "إبن حزم" ی ئەندەلوسی"علي بن حزم الاندلسي ٣٨٤ - ٤٥٦" دەربارەی دەرچوون لە دەسەڵاتی حاكمی فاجیر بابەتێكی زۆر گرنگی نوسیوەو، بەڵگەی ئەوانە دێنێتەوە كە فەرموویانە دەرچوون بە موتڵەق لە دەسەڵاتی حاكمی جائیر جائیز نییە، ئینجا یەكە یەكەی بەڵگەكانیان هەڵدەوەشێنێتەوە. ((زۆر گرنگە تالیبی عیلم بەووردی قسەكانی ئەو ئیمامە لەو بوارەوە بخوێنێتەوە)).

((احتجت الطَّائِفَة الْمَذْكُورَة أَولا بِأَحَادِيث فِيهَا "انقاتلهم يَا رَسُول الله قَالَ لَا مَا "صلوا" وَفِي بَعْضهَا [إِلَّا أَن تروا كفرا بواحاً عنْدكُمْ فِيهِ من الله برهَان ] وَفِي بَعْضهَا وجوب الصَّبْر (وَإِن ضرب ظهر أَحَدنَا وَأخذ مَاله) وَفِي بَعْضهَا فَإِن خشيت أَن يبهرك شُعَاع السَّيْف فاطرح ثَوْبك

على وَجهك وَقل إِنِّي أُرِيد أَن تبوء بإثمي وإثمك فَتكون من أَصْحَاب النَّار وَفِي بَعْضهَا (كن عبد الله الْمَقْتُول وَلَا تكن عبد الله الْقَاتِل) وَبِقَوْلِهِ تَعَالَى {واتل عَلَيْهِم نبأ ابْني آدم بِالْحَقِّ إِذْ قربا قرباناً فَتقبل من أَحدهمَا وَلم يتَقَبَّل من الآخر})).

ئینجا دەفەرموێ: ((أما أمره صلى الله عَلَيْهِ وَسلم بِالصبرِ على أَخذ المَال وَضرب الظّهْر فَإِنَّمَا ذَلِك بِلَا شكّ إِذا تولى الإِمَام ذَلِك بِحَق وَهَذَا مَا لَا شكّ فِيهِ أَنه فرض علينا الصَّبْر لَهُ وَإِن امْتنع من ذَلِك بل من ضرب رقبته إِن وَجب عَلَيْهِ فَهُوَ فَاسق عَاص لله تَعَالَى)).

ئیمام دەفەرموێ: ((هەموو ئەو فەرمانانەی خۆشەویستمان -صلی الله علیه وسلم- لە حاڵەتێکە کە ئیمام بەحەق ماڵی بردی و بەحەق لێیدای، بێگومان دەبێت ئارام لەسەر ئەوانە بگیرێت)).

ئینجا دەفەرموێ: ((وَإِمَّا إِن كَانَ ذَلِك بباطل فمعاذ الله أَن يَأْمر رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم بِالصبرِ على ذَلِك برهَان هَذَا قَول الله عز وَجل {وتعاونوا على الْبر وَالتَّقوى وَلَا تعاونوا على الْإِثْم والعدوان} )).

بەڵام گەر هات و ئەوە بە باتڵ بوو "واتە بە باتڵ ئیمام ماڵی خواردی و لەپشتی دای" پەنا بەخوا لەوەی کە پێغەمبەری خوا -صلی الله علیه وسلم- فەرمان بە ئارامگرتن لەسەر ئەوە بدات، بەڵگەی ئەوەش فەرموودەی خوای پەروەردگارە {وتعاونوا على الْبر وَالتَّقوى وَلَا تعاونوا على الْإِثْم والعدوان} پشتی یەك بگرن و هاوکاری یەکتری بکەن لەسەر چاکە و لە خواترسان.

((وَقد علمنَا أَن كَلَام رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم لَا يُخَالف كَلَام ربه تَعَالَى قَالَ الله عز وَجل {وَمَا ينْطق عَن الْهوى أَن هُوَ إِلَّا وَحي يُوحى} وَقَالَ تَعَالَى {وَلَو كَانَ من عِنْد غير الله لوجدوا فِيهِ اخْتِلَافا كثيرا} فصح أَن كل مَا قَالَه رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم فَهُوَ وَحي من عِنْد الله عز وَجل وَلَا اخْتِلَاف فِيهِ وَلَا تعَارض وَلَا تنَاقض)).

ئەوەشمان زانیوە کەلامی پێغەمبەری خۆشەویستمان - صلی الله علیه وسلم- پێچەوانەی کەلامی خوای پەروەردگار نییە، هەروەکو خوای پەوەردگار دەفەرموێ: {وَمَا ينطق عَن الْهوى أن هُوَ إِلَّا وَحي يُوحى} هەروەها دەفەرموێ: {وَلَو كَانَ من عِند غير الله لوجدوا فِيهِ اخْتِلَافا كثيرا} بۆیە ئەوەی پێغەمبەری خوا فەرموویەتی هەمووی لە خواوەیە.

((فَإذا كَانَ هَذَا كَذَلِك فيقين لَا شكّ فِيهِ يدْرِي كل مُسلم أن أخذ مَال مُسلم أَو ذمّي بِغَيْر حق وَضرب ظَهره بِغَيْر حق إِثْم وعدوان وَحرَام)).

گەر ئەوەش وابوو بە یەقینەوە و موسڵمان هیچ گومانی لەوە نییە، کە بردنی ماڵی موسڵمان یا کەسێکی زیمی بەبێ حەق و لێدانی ، حەرامە و تاوانە، هەروەکو خۆشەویستمان - صلی الله علیه وسلم- دەفەرموێ: [إن دماءكم وَأَمْوَالكُمْ وَأَعْرَاضكُمْ حرَام عَلَيْكُم] واتە: ((خوێن و ماڵ و عیرزتان لەسەر یەك حەرامە)).

ئینجا ئیمام "ئیبن حەزم" ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ- زۆر بەووردی بە بەڵگەکان دادەچێت و ڕوونکردنەوەی زۆر ورد دەدات و لە کۆتاییشدا ڕوو لەوانە دەکات کە فەرموویانە ناشێ لە دەسەڵاتی حاکمی فاجیر دەرچن گەر موسڵمان بوون، دەفەرموێ:((وَيُقَال لَهُم مَا تَقولُونَ فِي سُلْطَان جعل الْيَهُود أَصْحَاب أمره وَالنَّصَارَى جنده وألزم الْمُسلمين الْجِزْيَة وَحمل السَّيْف على أَطْفَال الْمُسلمين وأباح المسلمات للزِّنَا وَحمل السَّيْف على كل من وجد من الْمُسلمين وَملك نِسَاءَهُم وأطفالهم وأعلن الْعَبَث بهم وَهُوَ فِي كل ذَلِك مقرّ بِالْإِسْلَامِ مُعْلنا بِهِ لَا يدع الصَّلَاة فَإِن قَالُوا لَا يجوز الْقيام عَلَيْهِ بل قيل لَهُم أَنه لَا يدع مُسلما إِلَّا قَتله جملَة وَهَذَا أَن ترك أوجب ضَرُورَة أَلا يبْقى إِلَّا هُوَ وَحده وَأهل الْكفْر مَعَه فَإِن أجَازُوا الصَّبْر على هَذَا خالفوا الْإِسْلَام جملَة وانسلخوا مِنْهُ)).

واتە: ((چی دەڵێن بە سوڵتانێك جولەکە دەکا بە خاوەن کارەکانی و گاورەکان دەکا بە سەربازی خۆی و جیزیە دەسەپێنێ بەسەر موسڵمانان و منالی موسڵمانان دەکوژێ و ڕێ دەدا عیفەتی ئافرەتی موسڵمان بڕژێندرێ و هەرچی موسڵمانە دەیانکوژێ و دەست بەسەر ژن و منالی

موسلمانان‌دا دەکرێ و، لەگەڵ ئەو هەموو کارانەشی ئیقرار بە ئیسلام دەکا و بە ئاشکرا دەڵێ: من موسڵمانم و نوێژیش دەکا؟ گەر بڵێن: جائیز نییە لە دەسەڵاتی دەرچین، پێیان دەوترێ: ئەوە هیچ موسڵمانی نەهێشت، گەر وازی لێبهێنرێ تەنها خۆی و داروودەستە کوفریەکەی دەمێنێ ، گەر ئارامگرتنیان بە جائیز زانی لەسەر ئەو جۆرە ئیمامە ، ئەوا موخالەفەی هەمووی ئیسلام دەکەن و لێی دەردەچن)). تەواو بوو.

ئەو قسانەی ئیمام "ئیبن حەزم" زۆر گرنگە و هەموو ئەو بیروبۆچوونانە هەڵدەوەشێنێتەوە کە دراوەتە پاڵ ئەهلی سوننەت و جەماعەت کە گوایە دەرچوون بەرهوا نابینن لەسەر حاکمی فاجیر.

ئینجا دەفەرموێ: ((وَالْوَاجِب أَن وَقع شَيْء من الْجور وَإِن قل أَن يكلم الإِمَام فِي ذَلِك وَيمْنَع مِنْهُ فَإِن امْتنع وراجع الْحق وأذعن للقود من الْبشرَة أَو من الْأَعْضَاء ولإقامة حد الزِّنَا وَالْقَذْف وَالْخمر عَلَيْهِ فَلَا سَبِيل إِلَى خلعه وَهُوَ إِمَام كَمَا كَانَ لَا يحل خلعه فَإِن امْتنع من إِنْفَاذ شَيْء من هَذِه الْوَاجِبَات عَلَيْهِ وَلم يُرَاجع وَجب خلعه وَإِقَامَة غَيره مِمَّن يقوم بِالْحَقِّ لقَوْله تَعَالَى {وتعاونوا على الْبر وَالتَّقوى وَلَا تعاونوا على الْإِثْم والعدوان} وَلَا يجوز تَضْييع شَيْء من وَاجِبَات الشَّرَائِع وَبِاللَّهِ تَعَالَى التَّوْفِيق))(الفصل في الملل والأهواء والنحل: ٤/١٣٥).

واتە: ((واجیب ئەوەیە گەر جەور ئەنجامدرا گەر کەمیش بێت قسە لەگەڵ ئیمام بکرێت و ڕێی پێنەدرێ، گەر وازی هێنا و ملکەچی حەق بوو، وە ئامادەی جێبەجێکردنی حدودەکان بوو، ئەوا ناکرێ لابرێ و لەسەر ئیمامەتی خۆی دەمێنێ؛ گەر قبوڵی نەکرد ئەو واجیبانە جێبەجێ بکات کە لەسەریەتی جێبەجێی بکات و نەگەڕایەوە ، ئەوا دەبێت لابرد رێ و کەسێکی تر بهێنرێتە شوێنی ئەو کە حەق بەجێ بگەیەنێ، خوای پەروەردگار دەفەرموێ : {وتعاونوا على الْبر وَالتَّقوى وَلَا تعاونوا على الْإِثْم والعدوان} وە نابێت هیچ لە واجیبەکانی شەرع بفەوتێنرێ)) تەواو بوو.

ئینجا ئەو ئیمامە بەرێزە -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لەسەر بێ- ئەو قسەیە هەڵدەوەشێنێتەوە کە گوایە ئیجماعی ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەسەر دەرنەچوونە لە دەسەڵاتی حاکمی فاجیر و زۆر بە توندی وەڵامی کەسێك دەداتەوە بەناوی "ابْن مُجَاهِد البصرى الطَّائِي" کە باسی ئیجماعی کردووە لەسەر ئەو بابەتە و دەفەرموێ: ((...ذكر فِيهَا الإجماع فأتى بِكَلَام لَو سكت عَنهُ لَكَانَ أسلم لَهُ فِي أخراه بل الخرس كَانَ اسلَمَ لَهُ وَهُوَ ابْن مُجَاهِد البصرى الطَّائِي لَا الْمُقْرِئ فانه أَتَى فِيهَا ادّعى فِيهِ الإجماع أنهم أجمعُوا على ان لَا يخرج على أَئِمَّة الْجور فاستعظمت ذَلِك ولعمري انه عَظِيم ان يكون قد علم ان مُخَالف الإجماع كَافِر فيلقي هَذَا إِلَى النَّاس وَقد علم أَن افاضل الصَّحَابَة وَبَقِيَّة النَّاس يوم الْحرَّة خَرجُوا على يزِيد بن مُعَاوِيَة وَأَن ابْن الزبير وَمن اتبعهُ من خِيَار الْمُسلمين خَرجُوا عَلَيْهِ أَيْضا رَضِي الله عَن الخارجين عَلَيْهِ وَلعن قَتلتهمْ وَأَن الْحسن الْبَصْرِيّ وأكابر التَّابِعين خَرجُوا على الْحجَّاج بسيوفهم)). (مراتب الإجماع، ص: ١٧٧).

لە کۆتایی ئەو قسانەی ئیمام "إبن حزم" دەڵێین: زۆر بەداخەوە زۆرجار تا ئێستا باس لەوە دەکەن کە ئەهلی سوننەت و جەماعەت کۆڕان لەسەر دەرنەچوون لەسەر حاکمی فاجیر، نەك هەرئەوەندە، بەڵکو جەهل بە ناخی کەسانێك ئەوەندە قوڵ بۆتەوە حاکمی کافر و حاکمی موسڵمانی فاجیر لەیەك جوداناکەنەوەو موتڵەق دەرچوونیشیان کردۆتە نیشانەی خەواریج، بەو بۆچوونەشیان تاوانبارن کە قسە لەو دینە دەکەن بەبێ عیلم، ئەوەش حەرامە هەروەکو خوای پەروەردگار دەفەرموێ: {قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ الْفَوَاحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَالإِثْمَ وَالْبَغْيَ بِغَيْرِ الْحَقِّ وَأَنْ تُشْرِكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا وَأَنْ تَقُولُوا عَلَى اللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ} (الأعراف: ٣٣)

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ کە قبوڵی حەق دەکەن و ، لەو شوێنە دەوەستن کە دەقێکی صەحیحی صەریحی لەسەرە و، ملکەچی بەڵگەن بەبێ تەعەصوب بۆ قسەی ئەم و ئەو.

## چوارەم: ئیمام "محمد بن إبراهيم الوزير ٧٧٥ - ٨٤٠ هـ"

ئەو ئیمامە بەڕێزە خاوەنی چەند کتێبێکی زۆر گرنگە ، لەو کتێبە گرنگانەی "العواصم والقواصم في الذب عن سنة أبي القاسم" وەڵامدانەوەی ئەو نامەیە بوو کە شەیخەکەی "جمالُ الدین علي بن محمد بن أبي القاسم" بۆی دەنێرێ دوای ئەوەی ئیمام "ابن الوزیر" ڕوو دەکاتە دیراسە کردنی کیتاب و سوننەت و داوای دوورکەوتنەوە دەکات لە تەعەصوب بۆ قسەی زانایان، شەیخەکەی قبوڵی ئەو مەنهەجەی ئیمام ناکات، کە خۆی کەسێکی زەیدی بووە، بۆیە لە نامەکەی چەند ڕەخنەیەك لە مەنهەجی ئەهلی سوننەت و جەماعەت دەگرێ، ئیمامیش وەڵامی دەداتەوە بەو کتێبە کە بەڕاستی گەنجینەیەکە و تالیبی عیلم گەر مەبەستی بێت زیاتر بۆچوونی ئەهلی سوننەت و جەماعەت بزانێ گرنگە ئەو کتێبە بخوێنێتەوە، ئیمام دەفەرموێ:

((الوهم الثالث والثلاثون: ذكر السيد عن الفقهاء أنهم يجيزون إمامة الجائر، وحكى عن ابن بطّال أنه قال ما لفظه: الفقهاء مُجمعون أن المُتغلِّب طاعته لازمةٌ ما أقام الجُمُعات، والأعياد، والجهاد، وأنصف المظلوم غالباً، وأن طاعته خيرٌ من الخروج عليه، لما في ذلك من تسكين الدّهماء، وحقن الدماء ...)).

وەهمی سی و سێ:- واتە: ((ئیمام ڕەحمەتی خوای لێبێ ڕەخنەکانی بە وەهم لەقەڵەم داوە )). سەید دەڵێ: (کە مەبەستی شەیخەکەیتی ) ئەوان واتە ئەهلی سوننەت ڕێ بە ئیمامەتی جائر دەدەن، لە "ابن بطّال" دەگێڕێتەوە کە فوقەهایەکان کۆڕان لەسەر ئەوەی ئەو کەسەی بەزۆر هاتۆتە سەر حوکم تاعەتی واجیبە، گەر جومعە و جیهاد و جەژن و سەرخستنی کەسی ستەملێکراو بکات، وە گوێڕایەڵی چاکترە لە دەرچوون لە دەسەڵاتی، ئەوەش دوورکەوتنەوە یە لە فیتنە و پاراستنی خوێنی تێدایە.

<u>ئینجا ئەو کەسە دەڵێ:</u>

((فإذا كان هذا مذهب القوم، عرفت أنهم كانوا مع أئمة الجور الذين قتلوا الأئمة الأطهار، وأنهم شيعة الحجاج بن يوسف، بل شيعة يزيد قاتل الحسين عليه السلام، وشيعة هشامٍ قاتل زيد بن عليٍّ عليه السلام)).

که ئەوەش مەزهەبیان بێت ئەوکات دەزانی ئەوان "ئەهلی سوننەت" لەگەڵ ئیمامە جائیرەکان بوون، ئەوانەی ئیمامە پاکەکانیان کوشتووە ئەوانە لایەنگری "حەجاج" بو ون، بەڵکو لایەنگری "یەزید" بوون کە بکوژی حوسەینە -ڕەزای خوای لەسەر بێت- وە لایەنگری "هشام" بوونە بکوژی "زەیدی کوڕی عەلی" ڕەزا و ڕەحمەتی خوایان لەسەر بێت

ئینجا ئیمام "إبن الوزير"ڕەحمەتی خوای لێبێ - ئەو تۆمەتانە هەڵدەوەشێنێتەوەو دەفەرموێ :((أقول: اشتمل كلام السيد هنا على أوهامٍ كثيرةٍ، وهي تبين بالكلام على فصولٍ:

الفصل الأول: في بيان أن الفقهاء لا يقولون بأن الخارج على إمام الجَوْرِ باغٍ، ولا آثمٌ، وهذا واضحٌ من أقوالهم، ومعلومٌ عند أهل المعرفة بمذاهبهم، ويدلُّ عليه وجوهٌ:

الوجه الأول: نصُّهُم على ذلك وهو بيِّنٌ لا يُدفع، مكشوفٌ لا يتقنَّع، قال النووي في كتاب" الروضة " ما لفظه: الباغي في اصطلاح العلماء: المخالف لإمام العدل، الخارج عن طاعته بامتناعه من أداء واجبٍ عليه أو غيره، انتهى كلام النووي. (العواصم والقواصم في الذب عن سنة أبي القاسم ١٣/٨).

لە بەشی یەکەم گوتەی ئەو زانایانە دێنێتەوە کە فەرموویانە ئەو کەسەی لە ئیمامی جائیر دەردەچێ باغی نییە و تاوانباریش نییە، ئەوەش زۆر ڕوونە لە گوتەکانیان ئاشکرایە لای ئەوانەی شارەزای مەزهەبەکانیانن.

ئینجا باس لەو قەولەی ئیمام "النووي" دەکات کە دەفەرموێ: ((باغی لە زاراوەی زانایان ئەو کەسەیە پێچەوانەی ئیمامی عادل دەکات، ئەوەی لە دەسەڵاتی دەردەچێ بەوەی کە واجیبێکی بەجێ نەگەیاندووە)) تەواو بوو.

ئینجا ئیمام -ڕەحمەتی خوای لێبێ- زۆر بە وردی هەموو ئەو گومانانە دەڕەوێنێتەوە . ئەوەی زۆر گرنگیشە سەرنجی بۆ ڕاکێشین ئەوەیە؛ باغی ئەو کەسەیە دەردەچێ لە دەسەڵاتی ئیمامێکی عادل، ئەو کەسە باغی نییە کە هەوڵی لادانی حوکێکی کوفری دەدا و تێدەکۆشێ بۆ گێڕانەوەی حوکمی خوا - سبحانه وتعالى-

## لە کۆتایی ئەم بابەتەدا سەرنج بۆ چەند خاڵێکی گرنگ ڕادەکێشین:-

یەکەم: دەرنەچوون لە دەسەڵات زێدەڕەویەکی یەکجار زۆری لێکراوە، خەڵکانێك هەن بەتەواوی لەو بوارەوە سەریان لێشێواوە و گومڕا بووینە، لەو مانایانە حاڵی نەبووینە کە کێیە کەسی "باغی" بۆیە زۆر ستەم لە مسوڵمانان دەکەن و بە خەوارج وەصفیان دەکەن و، وەصفی خەوارج و تەکفیری دەدەنە پاڵ مسوڵمانان، ئەوەش بەڕاستی بۆچوونێکی یەکجار هەڵەیە، خوای پەروەردگار مان پارێزێ.

دووەم: مورجیئە هەروەکو ئیمام "قەتادە" دەفەرموێ: لەدوای فیتنەکەی "عبدالرحمن بن الاشعث" سەریهەڵدا "إِنَّمَا حَدَثَ الْإِرْجَاءُ بَعْدَ فِتْنَةِ فِرْقَةِ ابْنِ الْأَشْعَثِ". مورجئەکانیش گرووپێکی یەکجار ترسناکن لەسەر موسڵمانان بۆیە شەیخولئیسلام دەفەرموێ: ((فَلِهَذَا عَظُمَ الْقَوْلُ فِي ذَمِّ " الْإِرْجَاءِ " حَتَّى قَالَ إبْرَاهِيمُ النَّخَعِي: لَفِتْنَتُهُمْ - يَعْنِي الْمُرْجِئَةَ - أَخْوَفُ عَلَى هَذِهِ الْأُمَّةِ مِنْ فِتْنَةِ الأزارقة. وَقَالَ الزُّهْرِيُّ: مَا ابْتُدِعَتْ فِي الْإِسْلَامِ بِدْعَةٌ أَضَرُّ عَلَى أَهْلِهِ مِنْ الْإِرْجَاءِ. وَقَالَ الأوزاعي: كَانَ يَحْيَى بْنُ أَبِي كَثِيرٍ وقتادة يَقُولَانِ: لَيْسَ شَيْءٌ مِنْ الْأَهْوَاءِ أَخْوَفُ عِنْدَهُمْ عَلَى الْأُمَّةِ مِنْ الْإِرْجَاءِ. وَقَالَ شَرِيكٌ الْقَاضِي- وَذَكَرَ الْمُرْجِئَةَ فَقَالَ: هُمْ أَخْبَثُ قَوْمٍ حَسْبُك بِالرَّافِضَةِ خُبْثًا وَلَكِنْ الْمُرْجِئَةُ يَكْذِبُونَ عَلَى اللَّهِ. وَقَالَ سُفْيَانُ الثَّوْرِيُّ: تَرَكَتْ الْمُرْجِئَةُ الْإِسْلَامَ أَرَقَّ مِنْ ثَوْبِ سابري )) (مجموع الفتاوى: ٣٩٤/٧).

زۆر لە بیروبۆچوونی مورجیئەکان تاوەکو ئێستا ماوە و زیندووە، بەتایبەتی لە بواری ڕاپەڕین بەڕووی حاکم، گەرچی وەکو ناو کەس ناوێری بڵێ: من مورجیئەمە.

ئیمام "الشوكاني" -ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ- دەفەرموێ: ((وَلَقَدْ أَفْرَطَ بَعْضُ أَهْلِ الْعِلْمِ كَالْكَرَّامِيَّةِ وَمَنْ وَافَقَهُمْ فِي الْجُمُودِ عَلَى أَحَادِيثِ الْبَابِ حَتَّى حَكَمُوا بِأَنَّ الْحُسَيْنَ السِّبْطَ - رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ - وَأَرْضَاهُ بَاغٍ عَلَى الْخِمِّيرِ السِّكِّيرِ الْهَاتِكِ لِحُرَمِ الشَّرِيعَةِ الْمُطَهَّرَةِ يَزِيدَ بْنِ مُعَاوِيَةَ لَعَنَهُمُ اللَّهُ، فَيَالِلَّهِ الْعَجَبُ مِنْ مَقَالَاتٍ تَقْشَعِرُّ مِنْهَا الْجُلُودُ وَيَتَصَدَّعُ مِنْ سَمَاعِهَا كُلُّ جُلْمُودٍ)) (نيل الأوطار: ٢٠٨/٧).

واتە: ((هەندێك لە ئەهلی عیلم وەکو کەڕامیەکان "الكرامية: فيرقەيەكن لە مورجيئەكان" زێدەڕەویەکی زۆریان لەو بوارە کردووە"جودیان کردووە، واتە تەنها ئەو فەرموودانە دەخوێننەوە کە باسی گوێڕایەڵی حاکم دەکات و ئەوانی تر پشتگوێ دەخەن" تا گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کە حوکم بە باغی لەسەر"حوسەین" بدەن -ڕەزای خوای لەسەر بێت- لەبەرئەوەی لە دەسەڵاتی کەسێکی وەکو "یەزید" دەرچووە.

ئەوەی کە گرنگە لەو قسەیەی ئیمام "الشوكاني" ناسینی بیروبۆچوونی کەڕامیەکانە کە فیرقەیەکن لە مورجیئەکان، ئەوەندە زێدەڕەویان کردووە لە گوێڕایەڵی حاکم ئیمام "حوسەین"یان بەباغی لەقەڵەم داوە، بۆیە ئەوڕۆش خەڵکانێك هەن هەر درێژە پێدەری فیرقەی "مورجئە"ن، ئیمان؛ لای ئەوان تەنها گوفتاری زووبانە، لەسەر ئەو بنەمایەوە هەڵوێستەکانیان دەنوێنن خوای گەورە بمانپارێزێ.

<u>سێیەم:</u> کتێب و نوسینێکی زۆر لەو بوارەوە لەبەر دەستدایە، ئەو کەسەی کە مەبەستی بێت لە تەواوی ئەو بابەتە حاڵی بێت دەبێت هەولبدات هەموو بەڵگەکان کۆبکاتەوە تا لە کۆکردنەوەی هەموو بەشی وێنەکە، وێنەیەکی تەواوی بکەوێتە بەرچاو.

<u>چوارەم:</u> چۆن خەڵکێك گومڕا بووینە لە گوێڕایەڵی حاکی کافر و حاکی مسوڵمان لەیەك جودا ناکەنەوە ئاواش خەڵکێك لەڕویکی ترەوە گومڕا بووینە کە بەبێ زانستی شەرعی قسە لە سیاسەتی ئیسلامی دەکەن، ئەوە لەکاتێکدا قسەکردن لە سیاسەت پیشەی هەموو کەسێك نییە و بە هەموو

کەس ناکرێ، خۆشەویستمان - صلى الله عليه وسلم- دەفەرموێ: [كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ] (رواه البخاري).

سیاسەت کردن کارێکی یەکجار گەورە و پیرۆزە، خۆ ئامادەکردنێکی زۆری دەوێت، زۆرجار لە هەنگاوی هەندێك کەسی پێنەگەیشتوو کە بەناوی "سیاسەتی ئیسلامی" یەوە هاتونەتە پێش کورسی تاغوتەکان قایمتر دەکەن و، تەمەنی دیکتاتۆرەکان درێژتر دەکەن و، دەبنە هۆی لەباربردنی هەوڵە حەکیمەکان بۆ گۆڕینیان.

خوای پەروەردگار هەموو لایەکمان سەرکوتووی دونیا و دوارۆژ بکات لەسەر مەنهەجی سەلەف کۆمان بکاتەوە و بمانکات بە گرتنی هەنگاوەکان بۆ حەسانەوە لەژێر شەریعەتی ئەو ئیسلامە، کە تەنها ڕێیە بۆ سەربەرزی دونیا و بردنەوەی دوارۆژ.